# جیهانگیری

# و

# کاریگەری لەسەر سەروەری دەوڵەت

## عوسمان حەسەن شاکر



ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران

سلێمانی ـ ٢٠١١

**ئەكادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی كادیران**

دامەزراوەیەكی كەلتورییە بەپێی بڕیاری كۆنگرەی سێی ساڵی ٢٠١٠ ی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان دامەزراوە، ئەركەكەی بریتییە لە دەستەبەركردنی پێداویستییەكانی هۆشیاركردنەوەی سیاسی، فراوان كردنی چوارچێوەكانی رۆشنبیریی گشتی، تۆكمەكردنی بەهاكانی دیموكراسیو مافی مرۆڤ و دادی كۆمەڵایەتی لەكۆمەڵدا، تاوتوێ كردنی مەسەلەكانی بیری هاوچەرخو دابین كردنی كەرەستەی پێویست بۆ پێگەیاندنی كادیران لەبوارە هەمەجۆرەكاندا.

ناوی كتێب: جیهانگیری و كاریگەری لەسەر سەروەری دەوڵەت

ناوی نووسەر: عوسمان حەسەن شاكر

بڵاوكراوەكانی ئەكادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی كادیران

سلێمانی . ٢٠١١

ژمارەی سپاردنی بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان (١٨٤٨) ساڵی ٢٠١١

لەدەزگای چاپو پەخشی حەمدی چاپ كراوە

دیزاینو بەرگ: جوان قادر صۆفی

تایپ: رێناس تارق، شانیا یوسف

تیراژ: (٢٠٠٠) دانە

ژ. زنجیرە: (٤٠٦)

# ناوەڕۆك

| | بـــابەت | لاپەڕە |
|---|---|---|
| | دەرەنجام و ڕاسپاردەکان.................. | ٨٣ |
| | دەرەنجام.................................. | ٨٤ |
| | ڕاسپاردەکان.............................. | ٨٨ |
| | سەرچاوەکان.............................. | ٩٠ |

# پێشەکـــــی

پرۆسـەی جیهـانگیری بـەهۆی ئـەو کاریگەرییـە گەورانـەی کـە لەسەر بوارە سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی، کلتورییەکان دروسـتی کــردووە، دۆخێکــی خولقانــدووە کــە بۆتــە هــۆی ســەرلەنوێ پێداچوونەوە بەگـەلێك لـەو پرەنسیپ‌و چەمك‌و بەهایانـەی کـە تـا ئەوکاتـە بەشـتێکی پـیرۆزو قـابیلی دەسـتکاری نـەکردن‌و نـەگۆڕ دانرابــوون. یــەکێك لــەو چــەمکانەش کــە گــۆڕانێکی بنــەڕەتی بەســەرداهات، چــەمکی ســەروەری دەوڵــەتان یــاخود ســەروەری نیشتمانییە.

سەروەری نیشتمانی لەلایـەن حکومـەت‌و ڕژێمـە داخراوەکانـەوە وەك شـتێکی پـیرۆز تەماشای دەکـرێ‌و بەپاسـاوی پاراسـتنی ئـەم پیرۆزییـە سڵ لەئەنجامـدانی هـیچ تاوانێـك ناکەنـەوە دژ بـە گـەل‌و هاولاتیانی خۆیان. ئەو سیستەم‌و حکومەتانەی کە زیاد لەپێویـست بایــــەخ بــــە ســــەروەری دەوڵــــەت دەدەن‌و پیرۆزییــــەکی زۆری پێدەبەخــشن، ئــەو سیــستمانەن کــە بــە شــێوازەکانی کــاری دیموکراسـی‌و پەرلـەمانی تاڕادەیـەکی زۆر نـامۆن‌و مافـە سیاسـیە

بنەڕەتیەکانی هاولاتیانی خۆیانیان زەوت کردووەو، ڕێگە دەگرن لەئازادی ڕادەربڕین و لەبەڕێوەچوونی پرۆسەی هەڵبژاردن بەشێوەیەکی یاسایی و بەدوور لەدەستێوەردان و ساختەکاری، لەپرسە دارایی و مامەڵە ئابورییەکاندا شەفافیەت و کاری دامەزراوەیی پەیڕەو ناکرێ و وەك موڵکی تایبەتی و شەخسی سەیری سامان و دارایی دەوڵەت دەکەن.

ئەم ڕژێمانە لەپێناوی پاراستنی دەسەلاتەکەیاندا سڵ لەئەنجامدانی هیچ تاوانێك ناکەنەوەو مانەوەیان لەسەر کورسی دەسەلات هێڵی سورە، نەك بەرژەوەندییە بالاکانی گەل و نیشتمان.

ئەم ڕژێمانە بەپاساوی پاراستنی نیشتمان و لەسایەی چەمکی سەروەری رەهادا، ولاتیان کردبووە زیندانێکی گەورەو گەمارۆدراو چەپێنراو، بەلام هەروەك لەتوێژینەوەکەشدا ئاماژەم پێداوە جیهانگیری هاتوو درزی خستەدیوارە بەرزەکانی ئەم زیندانەوەو تەنانەت دیواری هەندێك لەو ڕژێمانەشی بەسەریاندا رووخاند و کۆتایی بەوشێوازە لەحکومڕانی هێنا.

لەم توێژینەوەیەدا هەوڵدراوە چارەسەری کێشەی دەستێوەردان و پێشێلکردنی سەروەری دەوڵەت بکرێت لەڕێگەی گرتنەبەری کۆمەڵێك ڕێوشوێنی یاسایی و سیاسی وەك ڕێزگرتن لەمافە بنەڕەتی و سەرەکیەکانی هاولاتیان و پەیڕەوکردنی

سیستمی دیموکراسیی و هەڵبژاردن و دەستاو دەستکردنی دەسەڵات لەنێوان گروپ و پێکهاتەو تێڕوانینە جیاوازەکاندا، بۆ ئەوەی هیچ جۆرە بیانوو پاساوێك نەدرێتە دەست زلهێزەکان و ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ ئەوەی سەروەری دەوڵەت پێشێل بکەن.

لەدووتوێی ئەم توێژینەوەیەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە، دەوڵەتان بۆ ئەوەی بتوانن رێگە لەدەستێوەردان و پێشێلکردنی سەروەری نیشتمانی ولاتەکانیان بگرن و بیانوو پاسا و نەدەن بەدەستەوە تا زلهێزو رێکخراوو ئاژانسە نێودەوڵەتیەکان، بەبیانووی پاراستنی مافی مرۆڤ و پاراستنی ئاسایشی نێودەوڵەتی و قەلاچۆکردنی تیرۆرو توندڕەویدا، سەروەری نیشتمانی و نەتەوەیی دەوڵەتان پێشێل بکەن، ئەوا لەسەر ئەم دەوڵەتانە پێویستە کە رێز لەمافە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ و پێکهاتە ئێتنی و مەزهەبیەکانی ولاتەکانیان بگرن و رێگە لەئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی ئازادو خاوێن نەگرن، رێگە بەدەستاو دەستکردنی دەسەڵات و گواستنەوەی ئاشتیانەی دەسەلات لەنێوان براوەی هەڵبژاردنەکان و دەسەلاتدا بدەن.

لێکۆڵینەوەکە دابەش کراوە بەسەر سێ بەشداو هەر بەشێکیش لەچەند باسێك پێکهاتووە. بەشی یەکەم بە ناونیشانی

ماهیـەتی سـەروەرییەوەیەو لەسـێ بـاس پێکهـاتووە. لەباسـی یەکەمـدا باسی چـەمکی سـەروەری دەکرێـت، لەباسـی دووەمـدا تیۆرەکـانی سـەروەریو روخـسارەکانی بـاس کـراوە، لەباسـی سێهەمدا تایبەتمەندییەکانی سەروەری خراوەتەڕوو.

بەشـی دووەم بەناونیـشانی جیهـانگیریو جۆرەکانیەوەیـە، ئـەم بەشـە لەسـێ بـاس پێکهـاتووە، لەباسـی یەکەمـدا پێناسـەی جیهانگیری لەڕووی زمانو زاراوەوە کراوە، لەباسی دووەمدا باسی گەشـەکردنی مێـژوویی جیهـانگیری کـراوەو باسـی سـێهەمیش تەرخانکراوە بۆ باسکردنی جۆرەکانی جیهانگیری.

بەشـی سـێهەم بەناونیـشانی کاریگـەری جیهانگیرییـە لەسـەر سـەروەری دەوڵـەت، ئـەم بەشـە لـەدووباس پێکهـاتووە لەباسـی یەکەمدا باسی سەروەری لەسەردەمی دەستێوەردانو جیهانگیریدا کـــراوە، باســـی دووەهـــەمیش تایبـــەتکراوە بەباســـکردن لەدامـەزراوەکانی جیهـانگیریو کاریگـەرییان لەسـەر سـەروەری دەوڵەت.

توێژینەوەکـەش بەخـستنەڕووی دەرئـەنجامو راسـپاردەکان کۆتایی پێهێنراوە.

# بــەشی یەکــەم

# ماهیەتی سەروەری

## ئەم بەشە بەسەر سێ باسدا دابەش کراوە:

### بــاسی یەکــەم
### چەمکی سەروەری

### باسی دووەم
### تیۆرەکانی سەروەری و رووخسارەکانی

### باسی سێهەم
### تایبەتمەندییەکانی سەروەری

# باسی یەکەم

## چەمکی سەروەری

شارەزایانی قانون لەو باوەڕەدان گەیشتن بەپێناسەیەکی گشتیو دیاریکراو سەبارەت بەچەمکی سەروەری، کارێکی قورسو ئەستەمە، لەبەر ئەوەی چەمکی سەروەری دەکەوێتە ژێر کاریگەری دوو فاکتەری سەرەکییەوە کە بریتین لە: فاکتەری کەسێتی (شخصي)و فاکتەری بابەتی (موضوعي)[1].

فاکتەری یەکەمیان بۆ دیاریکردنی چەمکی سەروەری پشت بەپێوەرە کەسێیەکان دەبەستێ، هەر خودی ئەم پێوەرانەش پەیوەندیدارن بەچەند پێدراوێکی فەلسەفیو کۆمەڵایەتیو ئاینییەوە، بەڵام فاکتەری دووەم بابەتییە پەیوەستە بەکاتو شوێنەوە، واتە پەیوەندی هەیە بەو پێدراوە زانستیو ژیاریانەی کە ئەم فاکتەرە لەخۆیان دەگرێو دەبێتە هۆی رەخساندنی نەرمییەکی گەورە بۆ چەمکی سەروەری[2].

---

(1) بروانە: د. عثمان علي میرانبك (الرواندزي)، السيادة في ضوء القانون الدولي المعاصر ودراسة السيادة العراقية، ١٩٩١ ـ ٢٠٠٣، اربيل ٢٠٠٩، ل٢٢.

(2) بروانە: د. عثمان علي میرانبك (الرواندزي)، سەرچاوەی پێشوول٢٤

بەڵام بەشێکی تر لەشارەزایان پێیان وایە کە جیاوازی بیرو بۆچوون سەبارەت بەچەمکی سەروەری لەلایەنی دەرەکی یان شکڵی تێپەڕ ناکات و ناگاتە سەر لایەنی جەوهەری. لەروانگەی ئەمانەوە سەروەری تەنها لەلایەنی رووخساریان دەرەکییەوە نەرمی تێدایە، بەڵام لەرووی جەوهەرییەوە سەروەری وەك یەکێك لەکۆڵەکەکانی کەسێتی یاسایی دەوڵەت، رەگەزێکی جێگیرەو قابیلی گۆڕان نییەو هەر ئەم لایەنەشە کە شایانی توێژینەوەیە لەهەردوو لایەنی سیاسی و یاساییەوە[3]

بیرۆکە (فکرة)ی سەروەری تا رادەیەك نوێیە، لەبەر ئەوەی بەم ماناو تێگەیشتنەی کە ئێستا هەیەتی هەتا سەدەی شانزە نامۆو نەناسراوبوو[4]. ئەم بیرۆکەیە هەر لەسەرەتاوە بەو بیرۆکە سیاسییە دەستی پێکرد کە داوای بەهێزکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی دەکرد لەبەرامبەر ئۆتۆریتە (نفوذ)ی فیئۆدالە (الاقطاع)کان لەناوخۆو، رزگاربوون لەدەسەڵاتەکانی کڵێسەو ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لەدەرەوەدا[5]، شایانی باسە تێورەی سەروەری راستەوخۆ

---

[3] بڕوانە: د. عثمان علی میرانبك (الرواندزي)، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤.

[4] بڕوانە: عبد الفتاح عبدالرزاق محمود، مبدأ عدم التدخل والتدخل في القانون الدولي العام، مطبعة وزارة التربية، اربيل ٢٠٠٢، ل١٣٣.

[5] بڕوانە: عبدالفتاح عبدالرزاق محمود، سەرچاوەی پێشوو. ل١٣٢.

پەیوەستە بەناوی فەقیهی فەرەنسی جان بودان (jenbodin) (١٥٢٠– ١٦٥٢)م، کە توانی لەشێوەی تێوەریەکی یاساییدا لەکتێبە بەناوبانگەکەیدا (شەش کتێبەکەی کۆماریی) ( six livers de la republigue) دایبڕێژێ*.

بودان لەو کتێبەدا بەم شێوەیە پێناسەی چەمکی سەروەری دەکات: "دەسەلاتێکی بالایە بەسەر هاولاتیان و هاونیشتمانیانەوە کە ملکەچ نابێت بۆ یاساکان، دەسەلاتێکی رەهاو سەربەخۆیە لەهەر دەسەلاتێکی تر، دەسەلاتەکانی پاشا پابەندی هیچ کۆت و بەندێك نابێت، جگە لەوەی کە یاساکانی ناتوانێ هیچ جۆرە گۆرانکاری یان دەستکارییەك لەیاساکانی خواوەندو سروشتدا بکات"**. هەروەها بودان دەڵێ: " کۆماریی (دەوڵەت) بەبێ دەسەلاتێکی خاوەن سەروەری... کۆماری نییە"[6].

بودان جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە خاوەن سەروەری ئەو کەسەیە کە دەسەلاتێکی رەهای بەسەر دانیشتوان و هەرێمەکەیەوە هەیەو، ئەم دەسەلاتەشی ناتوانرێ لەلایەن هیچ یاسا یان

---

* بڕوانە: عبدالفتاح عبدالرزاق محمود، سەرچاوەی پێشوو. ل١٢٤.

** بڕوانە: عبدالفتاح عبدالرزاق محمود، سەرچاوەی پێشوو، ١٢٤.

(6) بڕوانە: سیروان حامد احمد، الوضع القانوني لأتفاقية (sofa) وتأثيرها في سيادة الدول واستقلالها، مركز كردستان للدراسات الاستراتيجية،٢٠١٠، ل٥٥.

ڕێسایەکی دانراو (وضعي)وە سنوردار بکرێ یان کۆتو بەندی بۆ دابنرێ، بەڵکو تەنها لەلایەن یاساکانی خواوەندو یاسا سروشتییەکانو پابەندبوون (التزامات)ەکانی حاکم لەبەرامبەر ئەو کەسانەی کە خاوەن سەروەرین، هەروەها لەبەرامبەر تاکەکاندا جا هاوڵاتی خۆی بن یان بێگانە بن، دەتوانرێ کۆتو بەندی بۆ دابنرێو سنووردار بکرێ[٧]. بەڵام ئایا کێ خاوەن سەروەری پابەند دەکات بەڕێزگرتن لەم یاسایانە؟ بودان وەڵامی ئەم پرسیارەی نەداوەتەوە، لەبەر ئەوەی بودان ئەوە دووپات دەکاتەوە کە دەسەڵاتی باڵا لەدەوڵەت (سەروەری)دا، تەنها بەیاسا سروشتییەکانو ئایین کۆتو بەند دەکرێ. ئەوە ڕاستە کە دەسەڵاتی باڵا تەنها بەیاسا سروشتییەکانو ئایین پابەند دەکرێ، بەڵام هیچ میکانیزمێك نییە کە گرەنتی ئەم پابەندبوونە بکات ئایا ئەگەر دەسەڵاتی باڵا پابەندی ئەم یاسایانە نەبێت، دەرئەنجامو کاریگەرییەکانی چین؟ ناتوانین لەدوو توێی تیۆرەکەی بوداندا بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە بگەڕێین، لەبەر ئەوەی وا پێدەچێ کە بودان تەنها بایەخی بەلایەنی ناوخۆیی سەروەری داوە، ئەویش لەپێناوی ڕێکخستنی پەیوەندی لەنێوان دەسەڵاتی باڵا و هاوڵاتیان لەناو

---

[٧] بڕوانە: عبدالفتاح عبدالرزاق محمود، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٤.

دەوڵەتــدا. بــەڵام گرۆســیوس (grosions) کــە بایــەخ بەلایــەنی دەرەکــی ســەروەری دەدات، بــەم شــێوەیە پێناســەی ســەروەری دەکات، "دەسەلاتێکی سیاسی بالایە، کە لەدەستی کەسێکدا کۆ دەبێتــەوەو، هــیچ ئیرادەیــەکی ئینــسانی ناتوانــێ کارەکــانی هەڵبوەشــێنێتەوە"[٨] گرۆســیۆس هــەروەها جــەختی لەســەر سەروەرێتی رەهای دەوڵەت دەکردەوە، ئەم سەروەریەش بریتییە لەسەروەری بالای دەوڵەت.

تێبینــی ئــەوە دەکــرێ کــە هەنــدێ لەتوێــژەران و شــارەزایان بەشێوەیەکی رەهــا لەچــەمکی ســەروەری دەڕوانــن، وەك (تومــاس هۆبز) کە پێی وایە سەروەری تەنانەت لەئاینییش بالاترە[٩].

بەلام مامۆستا (فیردروس . verdross) بەشێوەیەك پێناسەی سەروەری دەکات کە لەگەڵ ئەو تێڕوانینەدا نییە کە بەشێوەیەکی رەهــا لەچــەمکی ســەروەری دەڕوانــن: "گوزارشــتکردنە لەکۆمــەڵێك پسپۆڕێتی کە یاسای نێو دەوڵەتی گشتی بەشێوەیەکی راستەوخۆ

---

[٨] بڕوانە: سیروان احمد حامد، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٦.

[٩] بڕوانە: پێشرەو حمە جان، تطور القانون الدولي العام في ظل النظام العالمي الجديد، مرکز کردستان للدراسات الاستراتیجیة، سلیمانیة، ٢٠١٠، ل١٧١.

بەدەوڵـەتانی دەبەخـشێ"[10]. هـەروەها (کوینـسی رایـت) دەڵـێ: "مەرکەزی یاسایی یەکێتییەکە (وحدة) کە ملکەچ دەبێت بۆ یاسای نێـو دەوڵـەتی گـشتیو بـالاتره لەیاسـای نـاوخۆیی"[11]. سـتارك دەڵـێ: " سـەروەری ئـەو دەسـەلاتەیە کـە دەوڵـەت هەیـەتی لەچوارچێوەی ئەو سنورەی کەیاسـای نێـو دەوڵەتی گشتی بـۆی دیاری کردووە"[12]

چـەمکی سـەروەری دەوڵـەت لەروانگـەی تێـڕوانینو بۆچـوونە چینایەتیو ئایدیۆلۆژییـە جیاوازەکانـەوە، خوێندنـەوەو پێناسـەی جیاوازو جۆراو جۆری بۆ کـراوە. بـۆ نموونە لەنووسـینی نوسـەرە سۆشیالیستەکاندا لێکدانەوەیەکی چینایەتی بۆ چەمکی سەروەری کـراوە، هـەروەك بـاقی چـەمکە کۆمەلایـەتیو سیاسیەکانی تـر لـەو روانگەیـەوە لێکدراوەتـەوە. نوسـەری روسـی (لیفـی) دەڵـێ: "سـەروەری سیاسـی جگـە لەدەسـەلاتی بـالای چـینی دەسـەلاتدار شـتێکی تـر نییـە، کـە رووی راسـتەقینەی دەردەکـەوێ، جـا

[10] بروانه: د. حسن الجلبي: الوجيز في القانون الدولي العام، شركة الطبع والنشر الاهلية، بغداد ١٩٦١، ل١٨٤.

[11] بروانه: د. جمعه صالح حسين محمد عمر، القضاء الدولي وتأثير السيادة الوطنية في تنفيذ الاحكام الدولية مع دراسة تحليلية لأهم القضايا الدولية، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٩٨، ل٦٨.

[12] بروانه: پێشڕەو حمه جان: سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٢.

رووپۆشێکی یاسایی لەخۆی بپۆشێ یاخود نا یاسایی، کە گوایە بـریتین لەدەسـەڵاتی بـاڵای دامو دەزگاکـانی دەوڵـەت کـە لەدەقـە یاساییەکاندا هاتوونو بەگەلێك شێوازی یاسایی جیاواز جێبەجێ کراون"[13].

مامۆستا (بیریزوفسکی)ی پۆلۆنیایی بەم شێوەیە لەسەروەری دەڕوانـێ: "سـەروەری بریتییـە لـەو دەسەڵاتە باڵایـەی دەوڵـەت، کـە ملکەچو پاشکۆی هیچ دەسەڵاتێکی تر نییە"[14].

کەواتـە دەتـوانین بڵـێین کـە بیرۆکـەی سـەروەری، بیرۆکەیـەکی یاسـاییە، هــەروەها خەسـڵەتێکی بنــەڕەتیو گرنگــی دەســەڵاتی سیاسییە لـەناو دەوڵەتـدا، کە کۆمـەڵێك پسپۆڕێتی لەسـەر ئاستی نـاوخۆییو دەرەکـی لـەخۆدەگرێو دەوڵـەت دەتوانــێ لەهــەردوو ئاسـتەکەدا پیادەیـان بکـات، شـایانی باسـە ئـەم پسپۆڕییانەی دەوڵـەت بـەپێی دەسـتووری دەوڵـەت دیـاری دەکرێـت، بەمـەرجی سنووری یاسـای نێودەوڵـەتی گشتی تێنەپـەڕێنیو ناتـەباش نەبێ لەگەڵیدا[15].

---

[13] بڕوانە: د. حكمت شبر، السیادة في عالم متغیر، مكتب الفكر والتوعیة في الاتحاد الوطني الكردستاني، سلیمانیة، ٢٠٠٦، ل١١.

[14] بڕوانە: د. حیکمت شبر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢.

[15] بڕوانە: پێشڕەو حمە جان: سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٢.

# باسی دووەم

## تیۆرەکانی سەروەریو رووخسارەکانی

سەروەری پرەنسیپێکی بنەرەتی رێکخستنی دەوڵەتو دەسەڵاتەکانێتی، لەبەر ئەوە ئەم چەمکە پەیوەستە بەکۆمەڵێك بەهاو بیرۆکەی سیاسیو یاساییەوە. دیاریکردنی چەمکی سەروەری بەشێوەیەکی وردو دیاریکراو، پێویستی بەلێکۆڵینەوە هەیە لەرەگو ریشە فیکریو فەلسەفیەکانی[(١٦)].

لەسەرەتای سەدەی شانزەهەمدا بیرۆکەی دەوڵەت وەك بیرۆکەیەکی یاسایی گەیشتە ئاستێکی پەسەند لەپێگەیشتنو کامڵبوون، بەهۆی فاکتەرە سیاسیو کۆمەڵایەتیە جیاوازەکانەوە. ئەم فاکتەرانە بوونە هۆی رووخانی سیستەمی دەرەبەگایەتیو دابەشبوونی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی جێرمانی، بۆ کۆمەڵێك دەوڵەتی سەربەخۆ، کە رزگاریان ببوو لەهەردوو دەسەڵاتی

---

(١٦) بڕوانە: دکتور/ السيد عبد المنعم المراكبي، التجاة الدولية وسيادة الدولة، دار النهضة العربية، القاهرة، ٢٠٠٥، ل٢٩.

ئیمپراتۆری و پاپا. پاش ئەم گۆڕانکاریانە بیرۆکەی سەروەری دەوڵەت وەك یەکێك لەتایبەتمەندییە بنەڕەتیەکانی دەوڵەت هاتە ئاراوە. لەم قۆناغەدا سەروەری بەدەسەلاتی بالای دەوڵەت دادەنرا کە هیچ دەسەلاتێکی تر نەیدەتوانی سنووورداری بۆ دابنێ یان پابەندی بکات[١٧]. بەلام لەدوای ئەو ڕەخنانەی کە ئاراستەی ئەم تێورەیە کرا، بیرۆکەی سەروەری لەرەهاوە گۆڕا بۆ سەروەری کۆتکراو. بیرۆکەی سەروەری لەسەردەمی نوێدا بە کۆمەڵێك قۆناغدا تێپەڕیوە، هەروەها چەندین بیروڕاو تێڕوانین کە لەسەر سەروەری قسەیان کردووە دەرکەوتن، بەلام کۆی ئەو تێڕوانینانە لەدوو تێورەی بنەڕەتیدا کورت دەبنەوە ، کە بریتین لە:

---

[١٧] بڕوانە: دکتور سامي جاد عبدالرحمن واصل، ارهاب الدولة في اطار القانون الدولي العام، منشأة المعارف بالاسكندرية، ٢٠٠٣، ل٢٦٧.

## یەکەم: تیۆری سەروەری ڕەها

ڕەگ و ریشەی ئەم تیۆرە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بیرۆکانەی سەبارەت بەچەمکی سەروەری لەسەدەکانی ناوەڕاستدا باڵا دەست بوو، لەو کاتانەدا وەك دەسەڵاتێك کە خودا بەخشیوێتی سەیری سەروەری دەکرا. سەرەنجام بەهۆی ئەم تێڕوانینەوە دەسەڵاتی ڕەها و بێ سنووری دەوڵەت سەری هەڵدا[18]. شایانی باسە تیۆرەی "دەسەڵاتدار هەڵە ناکات" یان (دەسەڵاتدار سەرچاوەی ئەخلاقە)ی ڕۆمانیەکان، کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر ئەوەی سەروەری ڕەها و بێسنوور بێت و ببێتە سەرچاوەی یاسا دانان و ئیلتزام. سەروەری ڕەها بەو مانایە دێت کە دەوڵەت ئازادی تەواوی هەیە لەرێکخستنی کاروباری ناوخۆیی و دەرەکیەکانیدا بەبێ پابەندبوون بەهیچ ڕێسایەکی باڵاتر لەخۆی، لەبەر ئەوەی لەم قۆناغەدا وەك شتێکی پیرۆز سەیری سەروەری دەکرا کە نابێت پێشێل بکرێ، بەڵکو دەسەڵاتی دەوڵەت لەسەرو هەموو دەسەڵاتەکانی ترەوەیە. لەم سۆنگەیەوەیە کە ئەم دەسەڵاتە ئازادو

(۱۸) بڕوانە: دکتور سامی جاد عبدالرحمن واصل، سەرچاوەی پێشوو ل۲٦۷.

سەربەخۆیە پابەندنیە بەهیچ دەسەڵاتێکی ترەوە، جا ئەو دەسەڵاتە ئایین بێت یان هەر رێسایەکی تر بێت[19].

لایەنگرانی ئەم تیۆرەیە بەو شێوەیە سەیری سەروەری رەهای دەوڵەت دەکەن کەیەکێکە لەو بنەما سەرەکییانەی کە یاسای نێو دەوڵەتی لەسەر بنیاتنراوە، و پێویستە لەسەر کۆمەڵی نێودەوڵەتی دان بەو سەروەرییەدا بنێ بۆ هەموو دەوڵەتان و ناشکرێ بەبێ رەزامەندی خودی دەوڵەتەکە هیچ جۆرە کۆت و بەندێك لەسەر سەروەری دەوڵەت دابنرێ[20].

شایانی باسە ئەم تیۆرەیە رووبەرووی چەندین رەخنە بۆتەوە، لەو سۆنگەیەوەی کە دەیانگوت کارپێکردنی دەبێتە هۆی دروستبوونی ئاژاوەیەکی نێودەوڵەتی، لەبەر ئەوەی لایەنگرانی تیۆری سەروەری رەها پێیان وایە پێویستە دەوڵەت لەبەرێوەبردنی کاروبارەکانی و لەپاراستنی بەرژەوەندییەکانیدا ئازادی تەواوی هەبێ بەبێ لەبەر چاوگرتنی بەرژەوەندی دەوڵەتانی تر. پەیرەوکردنی ئەم تیۆرەیە بووە هۆی ئەوەی دەستدرێژی بۆ سەر مافەکانی بەرامبەر ئاسایی و رێگەپێدراو بێت. ئەڵمانیا ئەم

---

[19] بڕوانە: سیروان حامد احمد، سەرچاوەی پێشوو ل٥٩.

[20] بڕوانە: دکتور سامی جاد عبدالرحمن واصل، سەرچاوەی پێشوو ل٢٦٨.

تیۆرەی کردە پاساو بۆ داگیرکردن‌و هەڵگیرساندنی جەنگ لەدژی دراوسێکانی.

دووەم: سەروەری کۆتکراو (ناڕەها):

دۆزینەوەی هەرێمە نوێیەکان‌و ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیە گەورانەی کە هاتنە ئاراوە، بوونە هۆی زۆربوونی پێویستی نێودەوڵەتی بۆ بەستنی پەیوەندی هاوشان‌و یەکسان لەنێوان دەوڵەتان کە لەسەر بنەمای ڕێزگرتنی بەرامبەر لەنێوان دەوڵەتان دروست بێت، بەشێك لەفقهی نێودەوڵەتی بانگەشەی پێویست بوونی کۆتکردنی سەروەری دەوڵەتیان دەکرد وەك وەڵام دانەوەیەك بۆ ئەو پێشکەوتنە نێودەوڵەتیانەی کە ڕوویان دابوو.

لەدیارترین ئەو بیرمەندانەی کە داوای کۆتکردنی سەروەری دەوڵەتیان کردووە (فیوریا)یە، کە پێی وایە یاسای سروشتی (The low of nature) لەگەڵ مرۆڤدا لەدایك بووە، گفتوگۆ لەگەڵ ویژدانی مرۆییدا دەکات‌و هەروەها پابەندیشی دەکات، ئەحکامەکانیشی ناکرێ لەلایەن مرۆڤەوە هەموار بکرێت، شایانی باسە ئەم یاسایە ڕێز لەهەموو مرۆڤێك دەگرێ‌و پێکهێنەری یاسای

کۆمەڵگای سروشتیە، لەبەر ئەوە سەروەری پابەندە بەحوکمەکانی ئەم یاسایەوە[٢١].

هەروەها بیرمەندی فەرەنسی "پیلیە" (Pellet) پشتگیری لەچەمکی سەروەری کوتکراو دەکرد، لەبەر ئەوەی لەروانگەی ئەوەوە بنەمای یاسای نێودەوڵەتی خۆی لەرێزگرتنی ئەو مافانەدا دەبینێتەوە کە هەر دەوڵەتێك لەچوارچێوەی ئەندامانی خێزانی نێودەوڵەتی لێی بەهرەمەندن[٢٢].

بەپێی ئەو تێروانینە هەر دەوڵەتێك ئەم مافە بنەرەتیانەی هەیە: مافی مانەوە، مافی یەکسانبوون لەگەڵ دەوڵەتانی تر، مافی ئاڵوگۆڕی بازرگانی، مافی رێزگرتن لەسەروەری. لەسۆنگەی ئەمەوە لەسەر هەر دەوڵەتێك پێویستە کە رێز لەمافە بنەرەتیەکانی دەوڵەتانی تر بگرێت، هەروەها پابەند بێت بەو ئەحکامانەی یاسای نێودەوڵەتی کە ئەو مافانەی رێکخستووە.

لەراستیدا ئەو قۆناغەی کە کۆمەڵی نێودەوڵەتی پێی گەیشتووە لەئەنجامی ئەو بانگەشەو داواکارییانەی کە داوای کۆتکردنی سەروەری دەوڵەتی دەکرد، بریتییە لەسەروەری دەرەکی یان

---

[٢١] بڕوانە: سیروان حامد احمد، سەرچاوەی پێشوو ل٦٠.

[٢٢] بڕوانە: دکتور سامی جا عبدالرحمن واصل، سەرچاوەی پێشوو ل٢٧١.

کـــۆتکردنی پەیوەندییـــەکانی لەگـــەڵ دەوڵـــەتانی تـــردا، بـــەڵام لەکۆتاییـــەکانی ســـەدەی بیـــستدا داواکاریـــەکان بـــۆ کـــۆتکرنی ســـــەروەری نـــــاوخۆیی دەوڵـــــەت لەرێکخـــــستنی کاروبـــــارە ناوخۆییەکانیـــدا دەســـتی پێکـــرد، بەتایبـــەتی کاتـــێ بڕیـــاردرا بـــەهۆکاری مرۆیـــی دەســـتێوەردان لـــەکاروباری نـــاوخۆی دەوڵەتـــدا بکرێت[٢٣].

شایانی باسە لەسایەی سیستمی نوێی جیهانی و جیهانگیریدا، دەوڵـــەت بەشـــێکی زۆر لەچـــەمکە کلاســـیکیەکانی لەدەســـتدا، بەتایبەتی رەگەزی سەروەری ناوخۆیی کە بەیەکێك لەرواڵەتەکانی سەروەری دەوڵەت دادەنرێ[٢٤].

ئامـانج لـەکۆتکردنی سـەروەری نـاوخۆیی دەوڵـەت ئەوەیـە کـە هەنـــدێ لەدەوڵـــەتان بـــەهۆی کـــارو هەڵـــسوکەوتی دوژمنکارانـــە بەرامبـەر بـەهاوڵاتیانی خـۆی، دەبنـە سەرچاوەیەکی مەترسـی بـۆ ســـەر هێمنـــی و ئاسایـــشی نێودەوڵـــەتی. لەبـــەر ئـــەوە کۆمـــەڵی نێودەوڵـــەتی ناتوانـــێ وەك تەماشـــاکەرێك بمێنێتـــەوە بەپاســـاوی پاراستنی سـەروەری نـاوخۆیی دەوڵـەت، هـەر چـەندە تـاکو ئێـستا

---

[٢٣] بڕوانە: سیروان حامد احمد، سەرچاوەی پێشوو ل٦٠.

[٢٤] بڕوانە: خەلیل عەبدوڵلا، پرەنسیپی دەستێوەرنەدان لەپەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا.

بەشێوەیەکی یاسایی و تەواو پاراستنی هاولاتیان لەناو سنوری ولاتەکانیاندا ڕێکنەخراوە.

بەلام سەرەتاکانی ئەم قۆناغە دەستی پێکردوە، با بەشێوەیەکی ناتەواوو پچڕ پچڕیش بێت.سەرباری ئەوەش هاتنی جیهانگیری کاریگەرییەکی گەورەی کردۆتە سەر چەمکی سەروەری ناوخۆیی دەوڵەت، کاتێ هەر شتێ لەناو سنوری دەوڵەتێکدا روو دەدات ناتوانرێ بشاردرێتەوەو لەلایەن دەوڵەتانی ترەوە پێی دەزانن. ئەو رووداوانەی کە لەسەرەتای نەوەدەکانەوە تا کۆتایی ئەو دەیەیە لەهەر یەکێك لەعێراق و سودان و ئەفغانستان و تەیموری رۆژهەلات روویانداوە، بەڵگەن لەسەر راستی ئەم بۆچوونانە.

سەبارەت بەچەمکی سەروەری راستیەك هەیە پێویستە ئاماژەی پێبدەین ئەویش ئەوەیە کە چەمکی سەروەری مایەی دەستکاری و هەموارکردنە لەهەر دوو روخساری دەرەکی و ناوخۆییدا، بەتایبەتی لەدوای نەمانی سیستمی جووت جەمسەری و زالبوونی سیستمی تاك جەمسەری لەدنیادا[٢٥].

---

[٢٥] بڕوانە: سیروان حامد احمد، سەرچاوەی پێشوو ل٦٠.

# باسی سێهەم

## تایبەتمەندییەکانی سەروەری

سەرباری ئەوەی لەنێوان شارەزایانی قانونندا لەسەر پێناسەکردنی چەمکی سەروەری جیاوازی لەبیروڕاو بۆچوونەکانیاندا هەیە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی کۆدەنگییەکیان لەسەر دیاریکردنی خاڵە گرنگو سەرەکییەکانی تایبەتمەندێتی سەروەری هەیە، کە بریتین لە:

١. سەروەری دەوڵەت سەروەرییەکی رەسەنو سەرەکییە، ئەمەش بەو مانایە دێت کە سەرچاوەو رەگو ریشەی سەروەری خودی دەوڵەتە، نەك هیچ دەسەڵاتێکی تر جا لەناوەوەبێت یان لەدەرەوە. لەبەر ئەوەی سەروەری دەوڵەت بالاترە لەهەموو دەسەلاتو دەزگاکانی تری ناو دەوڵەت[٢٦].

---

[٢٦] بڕوانە: سیروان حامد احمد، سەرچاوەی پێشوو ل٦٤.

٢. سەروەری دەوڵەت نابەخشرێت، لەبەر ئەو راستیەی کە ناکرێ سەروەری دەوڵەت بگویزرێتەوەو هەروەها ناشکرێ ببەخشرێت[٢٧].

٣. سەروەری دەوڵەت سەروەرییەکی گشتگیرە، واتە سەروەری دەوڵەت بەسەر هەموو هاولاتیانو بەسەر هەموو ئەو شتانەدا پەیرەو دەکرێت کە دەکەوێتە ناو سنووری دەوڵەتەکەوە، مەگەر هەندێ شت یان هاولاتی بەپێی رێکەوتنامەیەکی نێودەوڵەتی جیاکرابێتەوە. وەك پاراستنی نوێنەرایەتی دبلوماسی لەولایەی قەزائی ئەو ولاتانەی کە کاری تێدا دەکەن.

٤. سەروەری دەوڵەت هەمیشەیی و بەردەوامە، واتە تا دەوڵەت بوونی هەبێت سەروەریش هەیە، بەنەمانی دەوڵەتو لەناو چوونی سەروەریش نامێنێ. هەروەها گۆڕانکاری لەکابینە حکومیەکانیشدا بەمانای نەمانو کۆتایی هاتنی سەروەری نییە، لەبەر ئەوەی گۆڕانکاری لەحکومەتدا مانای گۆڕان یان نەمانی دەوڵەت نییە، سەروەریش پەیوەستە بەدەوڵەتەوە نەك حکومەت٠ هەروەها گۆڕانکاری لەو کەسایەتی و دەموچاوانەی کە حوکمڕانی دەوڵەتن

---

[٢٧] بڕوانە: دکتور عثمان علی میرانبك (الرواندزي)، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٨.

یـاخود گۆڕانکـاری لەسیـستمی حوکمـدا، کاریگـەرێتی لەسـەر سەروەری نابێت.

٥. سەروەری دەوڵەت قابیلی دابەشکردن نییە.

واتـە لـەناو دەوڵەتێکـدا تـەنها یـەك دەسـەڵاتی بـاڵا هەیـە، جارێکخستنی ئیداری‌و دەستووری ئەو دەوڵەتە هەر چۆنێك بێت، دەوڵەتی مەرکەزی بێت یان فیدڕاڵی یاخود کۆنفیدراڵی، ئەوا لە هەموو حاڵەتێکدا خاوەنی تەنها یەك سەروەرییە.

پرەنسیپی دابەشنەکردنی سەروەری لەو راستیەوە سەرچاوە دەگـرێ کـە پەیوەندییـەکی ئۆرگـانی‌و قـوڵ لـەنێوان سـەروەری‌و کەسێتی دەوڵەتدا هەیە[٢٨].

٦. سـەروەری قـابیلی دەسـتبەرداربون نییـە (عـدم قابليتهـا للتنازل عنها).

ئـەم بابەتـە بـووە هـۆی جێگـای بایـەخ پێـدانی ژمارەیـەکی زۆر لەشارەزایان‌و بیرمەندان‌و ئەوانەی لەهەردوو بـواری دەسـتووری‌و نێودەوڵەتی یاسادا کار دەکەن. وەك رابـەرانی شۆڕشـی فەرەنسی (مۆنتـسکیو) لـەکتێبی رۆحـی یاسـاکان یـان (رۆسـۆ) لـەکتێبی

---

(٢٨) بڕوانە: دکتور السيد عبدالمنعم المراکبي، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣.

پەیمانی کۆمەڵایەتیدا، رۆسو یەکەم کەس بوو کە لەکتێبەکانیدا باسی بیرۆکەی دەستبەردانەبوونی گەلی لەسەروەری خۆی کرد[٢٩].

[٢٩] بڕوانە: دکتۆر عثمان علی میرانبك (الرواندزی)، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٨.

## بەشی دووەم

# جیهانگیری و جۆرەکانی

ئەم بەشە بەسەر سی باسدا دابەشکراوە:

### باسی یەکەم

## پێناسەی جیهانگیری لەڕووی زمانو زاراوەوە

### باسی دووەم

## گەشەکردنی مێژوویی جیهانگیری

### باسی سێهەم

## جۆرەکانی جیهانگیری

# باسی یەکەم

## پێناسەی جیهانگیری لەڕووی زمان و زاراوەوە

جیهـانگیری یەکێکـە لەقۆناغـەکانی گەشـەکردنی سیـستمی سـەرمایەداری و بـیری لیبرالـی، کـە لـەدوای رووخـانی کـامپی سۆسیالیـستی بەشێوەیەکی مـۆدێرن و بەئاشـکرا خـۆی راگەیانـد، ئەگەر پێشتر چەندین کۆسپ و تەگەرە لەسەر رێگـای جیهانگیری هـەبوبن ئێـستا لەهـەموو کاتێـك زیـاتر زەمینـە بـۆ جیهـانگیری لەبارترە.

جیهـانگیری وەك زاراوەیـەك لـەناو زمـانی کوردیـدا پەیـدابووە و بەزمانـە ئەوروپاییـەکان Globalism Globalization، لەوشـەی Global گڵۆبالـەوە هـاتووە بـەمانای جیهـانی. ئـەم زاراوەیە بەشرۆڤەیەکی ئاسانتر بۆ تێگەیشتن بەمانای بەگشتیکردن "شمولی" دێت. واتە پەیوەندییە ئابوری و سیاسـی و کەلتورییەکان تـەواوی سـنورەکانی دەوڵـەتان دەبـەزێنن بەتایبـەتی دەوڵـەتی

نەتەوەیی و خۆیان دەگەیەننە کۆمەڵگا جیاوازەکان بەبێ رەزامەندی سیستمی سیاسی ئەو وڵاتانە[٣٠].

لەرووی مانا زمانەوانییەکەیەوە وشەی جیهانگیری وەرگێڕدراوی زاراوەی ئینگلیزی (Globalization)ە، هەروەها هەندێکی تریان بەگەردونگەرایی و گشتگەرایی "الشمولية" وەریانگێڕاوە. شیکردنەوەی وشەکەش لەڕووی زمانەوانییەوە بەمانای گشتاندنی شتێك و بەخشینی چوارچێوەیەکی جیهانییە پێی و فراوانکردنی مەوداکانێتی بەجۆرێك کە هەموو جیهان بگرێتەوە[٣١].

جیهانگیری (Mondalisation) ئەو دیاردەیەیە کە لێکۆڵینەوەو مشتومڕو شیکردنەوەی زۆری بۆکراوە لەکۆی هەموویاندا یەك پێناسەی هاوبەش بۆ واتای دیاردەکە نەکراوە،

---

[٣٠] بڕوانە: دلێر ئەحمەد، کوردو بەجیهانیبوون، گۆڤاری بیروهۆشیاری ژمارە ٢، مەکتەبی بیروهۆشیاری، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل١٤١.

[٣١] بڕوانە: محمد الغزالي ويوسف العادلي، سيادة الدول في ظل العولمة، جامعة مراكش، شعبة للدراسات الدولية، كلية الحقوق.

ئەمەش بەهۆی راجیاوازی لەنێوان لایەنگرو نەیارەکانی ئەم دیاردەیەدا[٣٢].

یەکێکی تر لەو رایانە پێی وایە کە جیهانگیری بەمانای سەروەری شارستانێتیەکی جیاوازە بەسەر باقی شارستانێتیەکانی تردا، یاخود رۆشنبیرییەکی دیاریکراوە کە کۆمەڵێك پرەنسیپی دیاریکراو تەحەکومی پێوەدەکات بەسەر کۆی وڵاتانی تردا[٣٣].

لەناوەراستی هەشتاکانەوە چەمك و زاراوەی جیهانگیری لەناوەندە ئەکادیمی و کلتورییەکانی خۆرئاوادا کەوتە ناو باس و خواس و مشتومرەوە. جیهانگیری لەسەرەتادا وەك ئاماژەدانێك بەدۆخێکی ئابوری دیاریکراوی جیهانی تەماشای دەکرا. بەڵام پاشترو لەدەیەی نەوەدەکاندا چەند رەهەندو لایەنێکی جیاوازی لەخۆگرت.

شایانی باسە تا ئێستا پێناسەیەکی یەکگرتوو دیاریکراو بۆ چەمکی جیهانگیری نییە یان نەکراوە، هۆکاری ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە چین و توێژە جیاوازەکان یاخود ئایدیۆلۆژیا و بیرورا

---

[٣٢] بروانە: میلود بن غربی، ئایندەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسایەی جیهانگیریدا، وەرگێرانی مافناس جەمیل محەمەد، خانەی وەرگێران، سلێمانی ٢٠١٠، ل٦٣.

[٣٣] بروانە: پێشرەو حمە جان، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٢.

جیاوازەکـــان لەروانگـــەی تێـــڕوانین و بەرژەوەندییـــە تایبـــەتی و جیاوازەکانی خۆیانەوە دەڕواننە چەمکی جیهانگیری.

بێگومـان دیـاردەی جیهـانگیری لایـەنی پـۆزەتیڤ و نێگـەتیڤی هەیـە ئەمـە راسـتیەکی حاشـا هەڵنـەگرە، نـەك تـەنها بـۆ دیـاردەی جیهـانگیری، بـەڵکو سـەبارەت بـەزۆر دیاردەو چـەمکی تـریش هـەر وایە. بەڵام ئەوەی جێگـای سـەرنج و تێبینـی کردنە بەشێکی زۆری ئـەو تێڕوانینانـە لەسـەر دیـاردەی جیهـانگیری تێـڕوانین و دادوەری کرنـی پێـشوەختەن، واتـە پـێش ئـەوەی بـەکردەوەو لەواقعـدا کارکردەکـانی جیهـانگیری دەربکـەون (جـا بـەڕووە پۆزەتیفەکەیـدا بێـت یـان نێگەتیفەکـەی) ئـەمان راو تێڕوانینـی خۆیـان لەسـەری دەربڕیوەو خستۆتە روو.

لـەکۆتایی ئـەم باسـەدا ئامـاژە بەچـەند پێناسـەیەك دەکـەین کـە لەلایـەن هەنـدێ لەبیرمەنـدانِی عـەرەبی و خۆرئاواییـەوە بـۆ چـەمکی جیهانگیری کراون.

مـالکۆم وتـرز دەڵـێ: جیهـانگیری پرۆسـەیەکی کۆمەڵایەتییـە کـە بەهۆیەوە ئەو کۆت و پێوەندانە بەر تەسك دەکرێنـەوە کـە جوگرافیـا بەســـەر سیـــستمە ئـــابوری و رۆشـــنبیری و کۆمەڵایەتیەکانـــدا دەیسەپێنێ بەجۆرێك کە کۆمەڵگای جیهـانگیری (المجتمـع العولمـة) دەبێتە خاوەنی رۆشنبیریەکی دیارییکراو. هەروەها لەپێناسـەیەکی

تریدا دەڵێ: جیهانگیری هەموو ئەو پێشکەوتن و گۆڕانکارییانەیە کە هەوڵدەدات لەپێناوی ئەوەی کە ئابووری جیهان بکات بەیەك ئابوری یەکگرتوو. محمد عابد ئەلجابری دەڵێ: جیهانگیری بریتییە لەجیهانێك بەبێ دەوڵەت و نەتەوەو نیشتمان، جیهانگیری دنیای شێك و دامەزراوە ئابورییە جیهانیەکانە سیستمێکە کە باز بەسەر دەوڵەت و نەتەوەو نیشتماندا دەدات، سیستمێك کە دەیەوێ هەموو ئەو ئاستەنگ و سنورانە هەڵبگرێ کە دێنە بەردەم ئەو دامەزراوەو کۆمپانیا ئابورییە جیهانیانەی کە هەژموونیان بەسەر دنیادا هەیە.

پێناسەی تۆماس فریدمان: جیهانگیری بریتیە لەفراوانکردنی مۆدێلی ئابووری ئەمریکی بەشێوەیەك هەموو جیهان بگرێتەوە، بەواتایەکی تر جیهانگیری بەمانای بەئەمریکایی کردنی جیهانە.

پێناسەی خەلدوون نەقیب: جیهانگیری بەشێکە لەبەشەکانی ململانێ و کێبەرکێ لەنێوان جەمسەرە ئابووری و رۆشنبیریە جیاوازەکان، لەرێگای بەکارهێنانی کۆمۆنیکەیشن و تەکنیکی پێشکەوتوو ئامرازەکانی راگەیاندن، لەپێناوی دەستبەسەراگرتنی توانست و ووزە جیاوازەکانی جیهاندا[٣٤].

---

[٣٤] بڕوانە: بحث العولمة؟ www.islamonline.net

# باسی دووەم

## گەشەکردنی مێژوویی جیهانگیری

سەبارەت بەمێژووی سەرهەڵدانی جیهانگیری لەناو بیریاران و مێژوونوساندا تێروانینی جیاواز هەیە، هەریەکەیان لەسۆنگەی باوەڕو بۆچوونی ئایدیۆلۆژی خۆیانەوە کاتێك یان سەردەمێکی جیاوازیان بۆ سەرهەڵدانی جیهانگیری دیاری کردووە. لەم باسەدا هەوڵ دەدەین پوختەیەك لەو تێروانین و بۆچوونە جیاوازانە سەبارەت بەسەرهەڵدانی چەمکی جیهانگیری بخەینە روو.

یەکێك لەو تێڕوانینانە پێی وایە کە سەرەتا و رەگ و ریشەی سەرهەڵدانی جیهانگیری دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دروستبوون و دەرکەوتنی سیستمی سەرمایەداری لە سەدەی ١٥ی زاینیدا. لەم سەدەیەدا لەلایەن چەند وڵاتێکی ئەوروپاییەوە بزوتنەوەیەکی بەهێز دەستی پێکرد لەپێناوی ناسین و دۆزینەوەی جوگرافی جیهاندا کە مەبەست و ئامانجی ئابووری و سیاسی لەپشتەوە بوو. گێڕانەوەی سەرەتای سەرهەڵدانی جیهانگیری بۆ دروستبونی سیستمی سەرمایەداری لەو سۆنگەیەوەیە کە هەردووکیان، واتە سەرمایەداری و جیهانگیری سروشتێکی جیهانی و نێونەتەوەییان

هەیە[٣٥]. هەر لەدرێژەی رەوتی بزووتنەوەی دۆزینەوە جوگرافیەکاندا، لەنیوەی دووهەمی سەدەی پازدەهەمەوە تا نیوەی دووەمی سەدەی شازدەهەم، بازرگانە ئەوروپاییەکان توانییان بەدەوری قارەی ئەفریقیادا بسوڕێنەوەو کۆنترۆڵی بزووتنەوەی بازرگانی ناو دەریای هند بکەن و لەوێوە خۆیان بگەیەننە ئەو پەڕی رۆژهەلات. سەرباری ئەوەش قارەی ئەمریکایان دۆزییەوەو هەر لەباکورەوە تا باشوری قارەکە خستیانە ژێر دەستی خۆیانەوە. گەیشتنی ئەوروپاییەکان بەکەنارەکانی قارەی ئەفریقیاو دۆزینەوەی ئەمریکا، سەرەتای قۆناغێکی مەزنە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا، چونکە (مەیدانێکی نوێی کاریان بۆچینی بۆرژوازی تازە پێگەیشتوو رەخساند)[٣٦].

بۆچونێکی تر هەیە کە سەرەتاکانی دەرکەوتنی جیهانگیری دەگەڕێنێتەوە بۆ پرۆژەی مارشاڵ. وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەرێگەی ئەم پرۆژەیەوە لەسالانی نێوان ١٩٤٨ - ١٩٩١دا زیاتر لە ١٢ ملیار دۆلاری بۆ سەر لەنوێ بنیاتنانەوەی ولاتانی پیشەسازی رۆژئاواو ژاپۆن خەرج کرد، ئامانجی ئەمریکا لەم پرۆژەیە کردنی

---

[٣٥] بڕوانە: بول هیرست وجراهام کومبسون، ما العولمه؟ الاقتصاد العالمی وامکانات التحکم، ترجمه د. فالح عبدالجبار، دراسات عراقیه، بغداد ـ اربیل ـ بیروت ٢٠٠٩، ل٣٦٥.

[٣٦] بڕوانە: کارل مارکس وفردریك أنجلس، البیان الشیوعي. مختارات، الجزء الاول ل٤٨.

ئەورووپا و ژاپۆن بوو بەبازاڕێك بۆ فرۆشتن و ساغكردنەوەی بەرهەمە پیشەسازیەكانی ئەمریكا و دۆزینەوەی هەلی وەبەرهەمهێنان و ڕێكخستنەوەی پەیوەندییە دراوییەكان و نرخی خەرجیەكان و ئامرازە نێودەوڵەتیەكانیان كە خۆی لە(بانكی نێودەوڵەتی)و (سندقی دراوی نێو دەوڵەتی)دەبینێتەوە. شایانی باسە كۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی چەندین شوێنەواری لێكەوتەوە كە بەوەرچەرخانێكی گەورەی گرنگ دادەنرێن لەمێژووی جیهانگیریدا. یەكێك لەدەرئەنجامەكانی جەنگی دووەمی جیهانی ئەوەبوو ئەو راستیەی بەراشكاوی دەرخست، كە هەژموونی راستەقینە ناكرێ بەتەنها لەرووی سەربازییەوە بێت، بەڵكو دەبێت ڕەهەندی ئابووری و ڕۆشنبیریش بگرێتەوە كە سەرئەنجام هەژموونێكی سیاسی گشتگیری هەموو لایەنەكانی لێدەكەوێتەوە. لێرەوەیە كە هەندێ لەتوێژەران ناوەڕاستی دەیەی چلەكان بەو ساتە مێژووییە دادەنێن كە بەردی بناغەی جیهانگیری ئەتڵەسی تیادا دانرا[٣٧].

بۆچوونێكی تر هەیە كە رەگ و ریشەی جیهانگیری دەباتەوە بۆ سەر فەلسەفەی رەواقیەكان "stoic philosophy"كە لەئەسینا

---

[٣٧] بڕوانە: سایتی : www.buraydahcity.net.

لەدەوروبەری سەدەی سێهەمی پێش زاینیدا سەریان هەڵدا. زینۆن کە رابەری ئەم بزوتنەوە فەلسەفیە بوو بانگەشەی بۆ دروستکردنی "شارێکی جیهانی . مدینة عالمیة" (city Cosmopolitan) دەکرد. ناوەرۆکی ئەم بیرۆکەیەش بریتی بوو لەوەی کە هاوڵاتیان هەموو برای یەکترن، ژیانێکی هاوبەش لەسایەی سیستمێکی یەکگرتوودا لەژێر سایەی یاسایەکی هاوبەشدا کۆیان دەکاتەوە[38].

تێروانینی تر سەبارەت بەرەگ و ریشەو مێژووی سەرهەڵدانی جیهانگیری، ئەو نموونە بەناوبانگەیە کە "رۆلاند رۆبەرتسۆن" لەلێکۆڵینەوەکەیدا بەناوی "رەنگرێژەی بارودۆخی گەردون" دایرشتووەو، تیایدا قۆناغەیەك لەدوای یەکەکانی گەشەی جیهانگیری و درێژبوونەوەیان لەرووی شوێن و کاتەوە دیاری کردووە بۆ پێنج قۆناغ بەم شێوەیەی خوارەوە:

---

[38] بڕوانە: هیڤی مجد حسن، أثر عولمة حقوق الانسان على مبدأ السیادة (دراسة تحلیلیة). چاپخانەی وەزارەتی کشتوکاڵ، هەولێر ٢٠٠٥، ل١٠.

**قۆناغی یەکەم: قۆناغی کۆرپەلەیی:**

ئـەم قۆناغـە لەئـەوروپا لەسـەرەتاکانی سـەدەی پێنجـەوە هـەتا ناوەڕاستی سەدەی هەژدەی خایاند، ئەم قۆناغە گەشـەی کۆمەڵگە نەتەوەییــەکان و بێهێزبــوونی ئــەو کۆتانــەی کــە لەســەدەکانی ناوەڕاسـتدا بـاوبوو بـەخۆوە بینـی، ئایـدیاکانی تایبـەت بـەتاک و مرۆڤایەتی تێیدا قوڵبووەو سەرەتای سەرهەڵدانی جوگرافیای نوێ بوو.

**قۆناغی دووەم: قۆناغی سەرهەڵدان:**

لەئەوروپا لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەوە هەتا ساڵی ١٨٧٠ی خایانـد، لـەم قۆناغـەدا گۆڕانێـك روویـدا ئـەویش سـەرهەڵدانی دەوڵــەتی هاوچەشــنی یــەکگرتوو بــوو، چــەمکەکانی تایبــەت بەپەیوەندییــە نێودەوڵەتیــەکان و تاکــەکان بــەو پێودانگــەی کــە هاوڵاتین و پێویستە بارودۆخیان بەیاسا دیاری بکرێت، دەرکـەوتن. بـەم شـێوەیە چـەمکێکی رۆشـنترو دیـاریکراوتر بـۆ مرۆڤایـەتی سـەریهەڵدا، رێککەوتنامـە نێودەوڵەتیـەکان بەرێژەیـەکی بەرچـاو زیادیــــان کــــرد، دامــــەزراوەکانی تایبــــەت بەرێکخــــستنی پەیوەندییـەکان و پەیوەنـدیکردنی نێـوان دەوڵـەتان زیادیـان کـرد، کێـشەی پەسـەندکردنی کۆمەڵـە نـا ئەورووپیـەکان لەکۆمەڵگـەی

نێودەوڵەتیدا سەریان هەڵدا، سەرباری گرنگیدان بەناسیۆنالیزم و جیهانێتی سەریان هەڵدا.

## قۆناغی سێهەم: قۆناغی دەستپێکردن:

ئەم قۆناغە لەساڵی ١٨٧٠وە تا بیستەکانی سەدەی بیستەمی خایاند، لەم قۆناغەدا ئەو چەمکانەی کە تایبەت بوون بەشوناسی نەتەوەیی و کەسی سەریان هەڵداو ژمارەیەك کۆمەڵەی نا ئەورووپی هاتنە کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتیەوەو پرۆسەی دارشتنی نێودەوڵەتی ئایدیاکانی تایبەت بەمرۆڤایەتی و هەوڵدان بۆ پیادەکردنی دەستپێکردو پێشکەوتنێکی گەورە لەژمارەو خێرایی میتۆدە گەردوونیەکانی پەیوەندیەکاندا روویداو یاری و خەلاتە نێودەوڵەتیەکان پەیدابوون، لەوانە یاری ئۆلۆمپی و خەلاتی نۆبڵ. هەروەها بیرۆکەی زەمەنی جیهانی و پیادەکردنی نیمچەگەردونی رۆژمێری گریگۆری لەخۆگرت. لەم قۆناغەدا جەنگی یەکەمی جیهان روویداو کۆمەڵەی نەتەوەکان دروست بوون.

## قۆناغی چوارەم: قۆناغی ململانێ لە پێناو هەژموون:

ئەم قۆناغە لەبیستەکانی سەدەی رابردووەوە تا شەستەکانی خایاندو جیاوازی و جەنگی فیکری سەبارەت بەو دەستەواژانەی کە تایبەتن بەجیهانگیری دەستپێکرد، ململانێی گەردوونی لەبارەی شێوازی ژیان و جۆرە جیاوازەکانی سەریهەڵداو جەخت لەچەند

بابەتێکی مرۆیانە کرایەوە وەك "هۆلۆکۆست" و بۆمبی ئەتۆمی و دەرکەوتنی ڕۆڵی نەتەوە یەککگرتووەکان.

## قۆناغی پێنجەم: قۆناغی نەبوونی دڵنیایی:

لەشەستەکانی سەدەی ڕابردووەوە دەستپێکردو بووە هۆی ناکۆکی و تەنگژە لەحەفتاکانداو جیهانی سێیەم چووە نێو کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیەوە ، هۆشیاری سەبارەت بەپرسە گەردوونیەکان چووە ئاستێکی بەرزەوە، ڕووداوی چوونە سەر مانگ ڕوویدا، قوڵبوونەوەی لەبەها پۆست مادییەکاندا بەخۆوە بینی. ئەم قۆناغە کۆتایی جەنگی ساردو بڵاوبونەوەی چەکی ئەتۆمی بەخۆیەوە بینی، دامو دەزگا گەردوونیەکان و بزووتنەوە جیهانیەکان بەرێژەیەکی زۆر زیادیانکردو بزووتنەوەی مافە مەدەنیەکان سەریهەڵداو سیستمی دوو جەمسەری کۆتایی هاتو گرنگیدان بەکۆمەڵگەی مەدەنی جیهانی و هاولاتیبوونی جیهانی زیادی کردو پاڵپشتکردنی سیستەمی ڕاگەیاندنی جیهانی هاتەکایەوە(٣٩)

---

(٣٩) ا ـ بڕوانە: میلود بن غربی، سەرچاوەی پێشوو: ل٧٤-٧٥.

ب ـ بڕوانە: هیفی امجد حسن، سەرچاوەی پێشوو: ل١١-١٤.

# باسی سێهەم

## جۆرەکانی جیهانگیری

بەشێوەیەکی گشتی جیهانگیری ریتمێکی نوێی ژیانە لەسەر ئاستی جیهان کە رۆژانەو بەردەوام لەپێشکەوتندایە، جیهانگیری پرۆسەیەکی هەمیشەیی و ناجێگیرە بەو مانایەی کە شێوەو رووخساری لەمرۆدا شێوەو رووخساری کۆتایی نییە. جیهانگیری لەهەوڵدانێکی بێوچاندایە لەپێناوی ئاوێتەو تێکەڵاو کردنی کات و شوێن لەسەر ئاستی جیهانی، لەئەنجامی ئەم پرۆسەیەشدا گۆڕانێکی گەورە لەهەموو بوارەکانی ژیانی رۆژانەماندا دروست دەکات.

بەرجەستە بوونی ناوەڕۆکی جیهانگیری یاخود دەرکەوتنی دەرئەنجامی کرداریی کاریگەرییەکانی جیهانگیری لەچەند بوارێکدایە کە پێیان دەوترێ رەهەندەکانی یاخود جۆرەکانی جیهانگیریو لەم باسەدا ئاماژەیان پێ دەدەین.

### ١. جیهانگیری ئابووری

سەرەتاو دەستپێکی جیهانگیری لەبواری ئابوریدا بوو، ئەوە بوو لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە وڵاتە پێشکەوتووکان

کۆمەڵێك سیاسەتی نوێیان پەیڕەوکرد کە ئامانج لێی پەرەپێدانی ئاڵوگۆڕی ئابوری و ئازادکردنی پەیوەندی بازرگانی نێوانیان بوو. ئەوە بوو کۆمەڵێك دامەزراوەو رێسای نێودەوڵەتییان دامەزراند بەمەبەستی رێکخستنی ئەم مامەڵانە.

لەئاکامی ئەم سیاسەتانەشەوە وورده وورده دیاردەی جیهانگیری ئابووری لەدایك بوو، هەروەك ئەوەی کە لەجیهانی ئەمڕۆدا دەیبینین.

بەشێوەیەکی گشتی جیهانگیری لەبواری ئابووریدا بەمانای پەرەسەندنی ئاڵوگۆڕی بازرگانی نێوان دەوڵەتان لەئەنجامی کەمکردنەوەیان هەڵگرتنی رسومو ئاستەنگییە گومرگییەکان و ناگومرکییەکان دێت لەبەردەم گواستنەوەی شمەك و خزمەتگوزارییەکاندا، لەبەر ئەوەی هیچ دەوڵەتێك نییە بتوانێ هەموو پێویستیەکانی هاولاتیانی خۆی لەشمەك و کەرەستەی خاوو خزمەتگوزارییە جیاوازەکان بەرهەم بهێنێ.

لەم سۆنگەیەوە بووە کە هەر لەئەزەلەوە هۆزو تیرەو دەوڵەتان شمەك و کالایان لەنێوان خۆیاندا ئاڵوگۆڕ پێکرووە، لەسەردەمی نوێشدا پەیوەندی و ئاڵوگۆڕی سوودو بەرژەوەندییەکان

بەشێوەیەکی بەرچاو بەرفراوان بووە، بەتایبەت لەنێوان وڵاتانی پێشکەوتووی ڕۆژئاوادا لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی[٤٠].

ئەگەر بێت و سەرنج بدرێتە پەیوەندییە ئابووری و بازرگانییەکان و لەگەڵ گەشەکردنی ئاستی بەرهەمهێنان بەراورد بکرێت، ئەو ڕاستیە بۆ هەموو لایەك ڕوون دەبێتەوە کە پەیوەندییە بازرگانییەکانی نێوان دەوڵەتان لەسەر ئاستی جیهان چەندین بەرابەری گەشەکردنی ئاستی بەرهەمهێنان بووە لەسەر ئاستی جیهانی، کە ئەمە نیشانەی توندو تۆڵ بوونی پەیوەندییەکانە ، هەورەها ئەوەش دەردەخات کە چیتر هیچ وڵاتێك ناتوانێت بەتەنها بەبێ بەستنی پەیوەندی توندو تۆڵی ئابووری وڵاتەکەی بەکارامەیی بخاتەگەڕ، دیارە ئەم ڕاستیە زلهێزە ئابوورییەکانیش دەگرێتەوە وەك وڵاتە یەکگرتووەکان. شایانی باسە ئەم ڕاستیە هێندەی تر و ڕاشکاوانەتر خۆی دەنوێنێت لەوڵاتە بچوکەکان، چونکە ئەم وڵاتانە بەپێی سروشتی کەمی و جۆراو جۆری بەرهەمهێنان و زیاتر پشتبەستنی بەناردنە دەرەوەی کاڵایەك یان ژمارەیەکی کەم لەکاڵا، توانا ئابوورییەکانی خۆی دابین دەکات، ئەم حاڵەتە بەزمانی ئابووری پێی دەوترێ وڵاتی کراوەتر بەڕووی

---

[٤٠] بڕوانە: ثناء عبيد، العولمة وعالم متغير، مركز الدراسات السياسية والاستراتيجية، www.acpss.ahrak.org.eg/ahram/2001/1/1

دەرەوەدا. لـــەئاکامی سیاســـەتی ئـــازادی بازرگانیـــدا، جۆرێـــك لەپسپۆڕیتی هاتە ئاراوەو وایلێهات کە هەر دەوڵەتێك یان کۆمەڵە دەوڵـــەتێك تایبەتمەنـــدبێت لەبەرهـــەهێنانی ئـــەو شمـــەك و خزمەتگوزاریانـەی کـە دەتوانێـت بەکوالێتییـەکی بـاش و نرخێکـی کەم بەرهەمی بێنێ، ئەم حاڵەتەش لەزانستی ئابوریدا پێی دەوترێ تایبەتمەندێتی رێژەیی.

ئەم دیاردەیە لەکۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا پەرەی سەندو زیاتر بەرفراوان بوو، کە پێی دەوترێ پشت بەیەکتری بەستنی هاوتـــا، بـــەمانای هـــەر دەوڵـــەتێك بـــۆ دابـــین کردنـــی بەشـــێك لەپێداویستیە سەرەکیەکانی پشتی بەوڵاتانی تر دەبەست، کە پێچەوانەکەشی راستە.

بەتێپـــەربوونی کـــات، پەیوەندییـــە ئابورییـــە نێودەوڵەتیـــەکان چـوونە نـاو چـوار چـێوەو شـێوازێکی نوێـوەو مامەڵـە ئابورییـە کۆنەکانی تێپەڕاند، کە لەئاڵوگۆڕو مامەڵەی ولاتان لەگەڵ یەکتردا قـــەتیس کرابـــوو، ســـەرەنجام رووخـــسارەکانی پەیوەنـــدی و تێکەڵبوونی جیهانی لەئابورییەوە پەلی هاویشت بۆ لایەنەکانی تری ژیان.

لەپاڵ ئاڵوگۆڕی بازرگانی نێوان دەوڵەتان، چەند شێوازێکی تری چالاکی ئابووری سنوور بڕ کە خۆی لەکومپانیا جیهانیەکان

یان کۆمپانیا فرە رەگەزیەکاندا دەبینێتەوە، سەری هەڵدا. ئەم کۆمپانیایانە بەفرە رەگەز ناوەزەد دەکرێ لەو سۆنگەیەوە کە سەرمایەکەی بەزۆری مولکی کەسانێکە کە سەر بەرەگەزنامەو دەوڵەتانی جیاوازن، هەروەها چالاکی ئەم کۆمپانیایانە لەرووی بەرهەمهێنانو ناردنە بازارەوە بۆ چەندین دەوڵەت درێژ دەبێتەوە.

لەچارەکی کۆتایی سەدەی بیستەمدا، کۆمپانیا جیهانییە زەبەلاحەکان سنوری ولاتەکانی خۆیانیان بەزاندو هەستان بەکردنەوەی هەندێك لق بۆ بەرهەمەکانیان، یاخود گواستنەوەی هەندێك بەشی کۆمپانیاکانیان بۆ ولاتە تازە پێگەیشتووەکان بەتایبەتی لەئاسیا وەك: تایوانو هۆنگ کونگو کۆریای باشورو سەنگافورە بەمەبەستی سوود وەرگرتن لەهێزی کاری هەرزانی ئەم ولاتانە.

ئامانجی ئەم کۆمپانیایانە لەم هەنگاوە بەرهەمهێنانی شمەکە بەهەمان کوالێتی جیهانی، بەلام بەتێچوونێکی کەم. لەبەر ئەوەی کرێی کرێکار لەولاتانی پێشکەوتوو بەرزەو سەعاتەکانی کاریش کەمو دیاری کراون، هەروەها خاوەنی سەندیکای بەهێزن بۆ بەرگری لێکردنیان. لەم سۆنگەیەوەیە کۆمپانیا جیهانیەکان بەرهەمەکانیان دەگوازنەوە بۆ ولاتانی ئاسیا بەمەبەستی کەمکردنەوەی تێچوونی بەرهەمهێنانو بەدەستخستنی کەرەستەی

خاو بەنرخێکی کەم. سەرەنجام ئەوە بۆتە شتێکی باوو ئاسایی بینینی کاڵایەك کە مارکەی ئەمریکی بەسەرەوەیە بەڵام لەتایوان دروست کراوە، ئەم کاڵایانەش لەجل و بەرگ و پێڵاوەوە هەتا ئامێرە کارەباییی و ئەلکترۆنیەکان دەگرێتەوە.

شایانی باسە جیهانگیری ئابوری بازاڕی دارایی جیهانیشی گرتۆتەوە کە خۆی لەیەکێتی بازاڕە دراوییەکانی جیهان و ئاڵوگۆڕی جیهانی بازاڕەکانی بۆرسەدا دەبینێتەوە. هەروەها تۆڕەکانی ئینتەرنێتیش رەهەندێکی گەورە بەئاستی چڕی و ئاسانی کارلیکە ئابورییەکان دەبەخشن کە بڕەکەی لەساڵی ١٩٩٩دا زیاتر لە١٠٠ بلیار دۆلاری ئەمریکی بووە[٤١].

## ٢. جیهانگیری سیاسی.

گرنگترین رەهەندی جیهانگیری رەهەندە سیاسیەکەیەتی و ئەو کاریگەرییانەیە کە لەسەر دەوڵەتی نەتەوەیی دایناوە، لەبەر ئەوەی دەوڵەت ئەرك و وەزیفەی زۆری هەیە جیهانگیری هاتووە کەمی بکاتەوە.

جیهانگیری هەندێك لەو ئەرکانە لەدەوڵەت دەسێنێتەوە و هەروەها لاوازی دەکات، بەڵام دەوڵەت لەناو نابات، بەڵکو رۆڵ و

---

[٤١] بڕوانە: ثناء عبید، سەرچاوەی پێشوو: ل٢.

ئەرکی دەوڵەت سەر لەنوێ دادەڕێژێتەوە. لەرووی سیاسیەوە جیهانگیری ئەو پەیامەی پێیە کە دەوڵەت تاکە بکەری سەر گۆڕەپانی سیاسەتی جیهانی نییە، بەڵکو لەپاڵ دەوڵەتدا ڕێکخراوە جیهانییەکان و کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان و کۆمەڵی نێو دەوڵەتی و ڕێکخستنی تری جۆراو جۆری ئاکتیڤ و کاریگەر بوونیان هەیە کە ئیش بۆ پەیوەندی بەهێزترو ئاوێتە بوونی نێو دەوڵەتی دەکەن، ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ کەمبوونەوەی گرنگی سەروەری لەرووی پراکتیکەوە[٤٢].

سیاسەتەکانی جیهانگیری لەسەر ئاستی جیهان رۆژ لەدوای رۆژ لەبەرگری سیاسەت لەبەرامبەر جیهانگیریدا کەم دەکەنەوە. ئەم سیاسەتە تێبینی دەکرێت لەپەیوەند بەو دەوڵەتانەی کە لەرابردوودا ململانێی زۆر توند لەنێوانیاندا هەبووە یاخود تەنانەت جەنگیش لەنیوانیاندا هەڵگیرساوە، بەلآم لەمرۆداو لەژێر کاریگەری سیاسەتەکانی جیهانگیریدا بەئاراستەی هاریکاری ئابوری هەنگاو دەنێن.

---

[٤٢] بڕوانە: میلود بن غربي، سەرچاوەی پێشوو: ل٧٩.

باشترین نمونەش بۆ پەیوەندی هاوڕێیانەو شەراکەتی ئەمڕۆ لەسەردەمی جیهانگیریدا، کە لەنێوان دوو دوژمنی دوێنێدا بوو، پەیوەندی نێوان چین و ئەمریکایە.

بەرژەوەندییە ئابوورییە هاوبەشەکانی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە، هەمیشە فاکتەرێکی کاریگەرە لەپێناوی تێپەراندن و چارەسەرکردنی ناکۆکییە سیاسییەکانی نێوانیان، جا چ ناکۆکییەکانی رابردوبێت یان ئەوەی کە لەئێستادا دروست دەبێت، بەشێوەیەکی دبلوماسی و هێمنانە.

هەروەها لەسیاسەتە ناوخۆییەکانی ولاتانیشدا، دیاردەیەک سەری هەڵداوە کە تا رادەیەکی زۆر لەبەرنامەی حیزبە سیاسیەکان دەچێت بەتایبەت لەولاتە پێشکەوتووەکاندا، ئەو دیاردەیەش بریتییە لەپاشەکشەی بایەخدانی هاولاتی ئاسایی بەپرسە سیاسیەکان و گرنگیدان و جەخت کردنەوە لەسەر ئەو پرسانەی کە پەیوەندی بەبژێوی و ژیانی رۆژانەیەوە هەیە، وەك: خوێندن، خزمەتگوزاری تەندروستی، بەرنامەی دابین کردنی کۆمەلایەتی، تەنانەت ئەم دیاردەیە بەئاستێك گەیشتووە لەبەر ئەوەی جیاوازی لەنێوان حیزب و لیستەکانی بەشداربووی هەڵبژاردنەکان نەماوە لەرووی سیاسیەوە، ئەم لیست و پارتانە دەست بۆ پرسە کەسی و

ئەخلاقیەکانی نەیارەکانیان دەبەن لەبری پرسە سیاسی و چارەنووسسازەکان[٤٢].

شایانی باسە جیهانگیری سیاسی پەیوەستە بەدەرکەوتنی کۆمەڵێك هێزی جیهانی و هەرێمی و ناوچەیی لەماوەی دەیەی نەوەدەکاندا، ئەم هێزانە کێبەرکێی دەوڵەتانیان دەکرد لەبورای سیاسیدا. دیارترینی ئەو هێزانەش بریتین لەبلۆکە بازرگانییە هەرێمایەتیەکانی وەك: بازاڕی هاوبەشی ئەوروپا، کە یەکێتیەکی دراوی دروست کردو لەرێگەی بانکی ناوەندی ئەورپا کاری دەکرد. (ئەم بانکە لەساڵی ١٩٩٩دا دروست کراو ئێستا سەرپەرشتی دراوی یۆرۆ دەکا).

ئەزموونی تێکەڵاو بوونی ئەوروپایی، لەبنەڕەتدا لەسەر بنەمای دەستبەردار بوونی ئارەزوومەندانەی وڵاتانی ئەوروپی لەهەندێك لەرووخسارەکانی سەروەری لەبەرژەوەندی قەوارەیەکی هەریمایەتیدا کە بەرەو یەکێتی ئابوری هەنگاوی دەنا دروستبوو، کە رەنگە لەداهاتوودا یەکێتیەکی سیاسیشی لێبکەوێتەوە لەرێگەی دەرکەوتنی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەوروپاوە، کە لەرووی سیاسەتی دەرەکی وبەرگرییەوە هاو هەڵوێست و یەك سیاسەتیان

---

[٤٢] بڕوانە: ثناء عبید، سەرچاوەی پێشوو: ل٤.

دەبێ و دەبنە هێزێکی کێبەرکێکاری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەسەدەی داهاتوودا. یەکێك لەدەرکەوتەکانی پرۆسەی جیهانگیری سیاسی بریتییە لەتەشەنەسەندنی کۆمەڵێك بەهاو پرەنسیبی سیاسی کە پێویستە تەواوی دەوڵەتانی جیهان لەپرۆسەی حوکم کردنی وڵاتەکانیاندا رەچاوی بکەن وەك: رێزگرتن لەمافەکانی مرۆڤ و جێبەجێکردنی میکانیزمەکانی دیموکراسی و فرەلایەنی سیاسی و ئازادی بیرورا لەژیانی سیاسیدا. رێزگرتن لەم بەهایانە وەك ڤیزایەکی نێودەوڵەتی لێهاتووە بۆچوونە ناو هەندێك رێکخراوی نێودەوڵەتی و سوودمەند بوون لەکۆمەکی ئابووری نێودەوڵەتی، لێرەدا هەندێك لەپسپۆران باس لەدۆخێك دەکەن کە تێیدا مۆدێلێکی حوکم کردن لەجیهاندا دروستبووەو دەوڵەتان دەبێت رەچاوی بکەن[44]

---

[44] بڕوانە: عوسمان حەسەن شاکر، پرسی سەروەری دەوڵەتان لەسایەی بەجیهانیبووندا، گۆڤاری کەلتور ژمارە (٢)، لەبڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادران، سلێمانی، ٢٠١٠.

### ٣. جیهانگیری کلتوری.

جیهـانگیری کلتـوری تایبـەت بـەخۆی هەیـە، ئـەم کلتـورە نەنوسـراوە. ئـەم کلتـورە کلتـورێکی جیهـانی و کاریگـەرە، فراوانخـوازەو دەچێتە نـاو هـەموو وڵات، هـەموو دەوڵـەت، هـەموو گەلێکەوەو کاریگەریەکەشی بەرفراوان و بێسنورە[٤٥].

بـواری رۆشـنبیری یەکێکـە لـەگرنگترین ئـەو بوارانـەی کـە جیهانگیری کاریگـەری لەسەر داناوە (جا ئەم کاریگەرییە بەباشـە بێت یان بەخراپـە)، ئەمـەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە جیهانگیری لەچەند پێکهاتەیەك پێکدێ کە تەواوکەری یەکترین و تیایدا لایەنی سیاسی پەیوەندی بەلایەنی ئابوورییەوە هەیە، ئەو دوو لایەنەش بەیەکەوە لایەنی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری تـەواو دەکـەن، سـەرەنجام هـیچ لایـەنێکیان بەسـەربەخۆ نامێننـەوە. لـەم سـۆنگەیەوە، جیهانگیری کلتـوری دیارەیەکـە پاڵپشتی خـۆی لەهێزی ئـابوری و دەسترۆیـشتوویی سیاسـی و پێـشکەوتنی تەکنـەلۆژیادا دەبینێتەوە[٤٦].

---

[٤٥] بڕوانە: عوسمان حەسەن شاکر، سەرچاوەی پێشوو: ل١١٦.

[٤٦] بڕوانە: میلود بن غربی، سەرچاوەی پێشوو: ل٨٥-٨٦.

ئەگەر لەرووی ناوەڕۆکەوە سەیری ئەم جۆرە رۆشنبیرییە بکەین دەبینین کۆمەڵێك خەسڵەتی دیاریکراوی هەیە، وەك: رووکەشییە، رۆشنبیری دەستکەوتی خێرایە، رابواردن و خۆشی کاتی، ورووژاندنی غەریزەکان و ... واتە بریتیە لەبڵاوکرنەوەی ریتم و شێوازی ژیانی بەکاربردنی رۆژئاوایانەو ترویج کردن بۆ پیشەسازیو بەرهەمە پیشەسازییەکان لەرێگەی مانگە دەستکردەکان و کەناڵە ئاسمانیەکانەوە، تەنانەت لەرێگەی شێوازی ژیانی رۆژانەی وەك: خواردن و خواردنەوەو جل و بەرگ (پۆشاك)و هۆیەکانی گواستنەوەو تەلەفۆن و تەلەفزیۆن و سیستمی خوێندن و سەپاندنی زانست و زانیاری بەزمانە بیانیەکان و ریزی درێژی کۆچبەران لەبەردەم دەرگای باڵوێزخانەی وڵاتە پیشەسازیەکاندا.

جیهانگیری کلتوری دەبێتە هۆی فراوانکردنی ئەو پانتاییە هاوبەشەی کە لەنێوان رۆشنبیرییە جیاوازەکانی جیهاندا هەیە، هەروەها داهێنانی رۆشنبیرییەکی نوێ کە کراوە بێت بەسەر هەموو بیروڕاو تێڕوانین و پێشکەوتنە جیهانیەکاندا، بەگوزارشتێکی تر ئامانجی جیهانگیری کلتوری دروست کردنی کۆمەڵێکی مرۆڤایەتی یەککگرتووە.

ئەم جیهانگیرییە کلتورییەی کە ئێمە ئێستا بەکردەوە تیایدا دەژین، بەرهەمو لەدایکبووی دوو پێشکەوتنی بنەڕەتیە، یەکەمیان

ئەو پێشکەوتنە سیاسییە بوو کە لەکۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا سەرتاپای جیهانی گرتەوە، ئەویش بریتی بوو لەکۆتایی هاتنی جەنگی سارد لەنێوان وڵاتە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانەکانی لەلایەک و یەکێتی سۆڤێت و هاوپەیمانەکانی لەلاکەی ترەوە. دووەمیان بریتی بوو لەو پێشکەوتنە مەزنەی کە لەبواری تەکنەلۆژیا و هۆیەکانی پەیوەندی جیهانی و پەخشکرنی راگەیاندنی ئاسمانیدا هاتە ئاراوە، ئەم پێشکەوتنەی دووەمیان بووە هۆی بەستنەوەو ئاوێتە کردنی مرۆڤەکان بەیەکترییەوە لەهەر ساتە وەختێک و لەهەر گۆشەیەکی جیهاندا[٤٧].

کۆتایی هاتنی جەنگی سارد بووە هۆی نەمانی بەربەستەکان لەبەردەم گواستنەوەی زانیاری و کارلێکردنی مرۆڤەکان لەسەر یەکتری لەسەر تا سەری جیهاندا. هەروەها نەمانی دوژمنایەتی سیاسی و جیاوازی ئایدیۆلۆژی لەنێوان هەردوو بەرەکەدا، بوونە هۆی بەهێزکردنی ئەو هەستەی کە هەمووان لەجیهانێکدا دەژین و ئەو پرسە گرنگە جیهانیانەی کە کاریگەرییان لەسەر ژیانی رۆژانەی مرۆڤەکان هەیە، کۆمەڵە پرسێکن کە سروشتێکی جیهانییان هەیە. بۆ نموونە: بایەخدان بەمافەکانی مرۆڤ و

---

[٤٧] بڕوانە: ثناء عبید، سەرچاوەی پێشوو: ل٤.

دیموکراسـی و پارسـتنی ئاشـتی و عەدالـەتی کۆمەڵایـەتی و هـەوڵی ژیانێکی شکۆمەندانەو پاراستنی ژینگەو شەفافیەت و لەناوبردنی گەنـدەڵی، ئەمانـە هـەر هـەموو جیهـانین و جێگـەی بایەخپێـدانی کۆمەڵی مرۆڤایەتین.

ئەوەی نوێیـە لەسـەردەمی جیهانگیریـدا، ئەو هۆشیارییە نوێیـە کـە بەشـێوەیەکی هێـواش و لەسـەرخۆ لـەنێوان مرۆڤەکانـدا بڵاودەبێتـەوە . بـەبێ لەبەرچـاوگرتنی رەنـگ و روو، ئینتیمـای سیاسـی، ئاستی کۆمەڵایـەتی و رۆشـنبیری . سەبارەت بەو کێشەو گرفتانەی کە پێشتر تەنها بۆ دەوڵـەتان و ئاژانسە نێودەوڵەتیـەکان و هەندێك رێکخراوی دیاریکراوو بەشێك لەرۆشـنبیران قۆرخ کرابوو. هـەروەها لەسایەی جیهانگیریـدا بایـەخی رێکخـراوە ناحکومیـەکان زۆر زیادی کردووەو لەگەڵ ئەوەشـدا دەرفـەت لەبـەردەم ژمارەیـەکی زۆر لەمرۆڤەکانـدا رەخـساوە بـۆ ئـەوەی کاریگـەری لەسـەر رای گشتی و پرۆسـەی دروسـتکردنی بڕیـاری جیهـانی دابنـێن، هەنـدێك کەس ئەم دیاردەیـەی کـە لەسـەردەمی جیهـانگیری سـەری هەڵـداوە، بەدیارەی کۆمەڵی مەدەنی جیهانی ناوزەد دەکەن.

بەکورتی، چەمکی جیهانگیری لەبورای کلتوریـدا وادەردەکـەوێ کـە سـەرکەوتنی کلتـوری بـاکوری پێـشکەوتووە بەسـەر باشـوری دواکەوتوودا و سـەپاندنی زەوق و رۆشـنبیری ئـەمریکی خۆرئاواییـە

بەسەر فرە کلتورییدا. شایانی باسە ئەم جیهانگیرییە بەپێی ئەو شێوازانەی کە باسمان کرد، مەترسی گەورەو کاریگەر دروست دەکات لەسەر تایبەتمەندێتی فرە کلتوری بەقازانجی تاکە یەك کلتورو رۆشنبیری جیهانی. لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە لەتواناو دەسەلاتی هیچ دەوڵەتێکدا نییە دەروازەی سنوورەکانی بەڕووی ئەو رۆشنبیریو زانستانەی کە رۆژانە بەهۆی جیهانگیرییەوە بەدنیادا بلاودەبنەوە، دابخات.

کارلێککردن لەگەڵ هەلومەرجی جیهانگیری پێویستە بۆ پاراستنی شوناسی نیشتمانی تایبەتمەندی هەرێمی، بەلام بانگەشە بۆ ئەم تایبەتمەندییە لەوانەیە بێ پاساو بێت لەحاڵەتی سەرهەڵدانی کلتورێکی جیهانی تر کە چەند چەمکێك لەگەڵ خۆیدا بهێنێت، کە لەوەپێش بوونیان نەبوو بێتو ببنە هۆی فەراهەم کردنی فاکتەرەکانی ئارامیو خۆشگوزەرانی، هەروەها ئاشتیو ئاسایشی نێودەوڵەتی بسەپێنێت[٤٨].

---

[٤٨] بڕوانە: میلود بن غربی، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٩.

# بەشی سێهەم

## کاریگەری جیهانگیری لەسەر سەروەری دەوڵەت

بۆ زانینی دەرئەنجامە سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتیەکانی ئەم پرۆسەیە، ئەم بەشە بەسەر دوو باسدا دابەشکراوە

### باسی یەکەم
### سەروەری
### لەسەردەمی جیهانگیریدا

### باسی دووەم
### دامەزراوەکانی جیهانگیریو
### کاریگەرییان لەسەر سەروەری دەوڵەت

# باسی یەکەم

## سەروەری لەسەردەمی جیهانگیریدا

کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهان، کۆمەڵێك گۆڕانکاری قوڵی لەپەیوەندییە نێودەوڵەتیەکاندا هێنایە ئاراوە، چ لەڕووی سیاسی و چ لەڕووی هاوسەنگی نێوان هێزەکانەوە، بەتایبەتی لەدوای دەرکەوتنی یەکێتی سۆڤیەت و ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا وەك دوو زلهێزی جیهانی.

لێرە بەدواوە ئیدی ئەورووپا وەك تەنها سەنتەری سیاسەتی دەولی و ئابووری جیهانی کۆتایی هات. لەپرۆسەی دووبارە بنیاتنانەوەی ئابوری داڕوخاوی ئەورووپای دوای جەنگدا، ولاتە یەکگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیەت ڕۆڵی سەرەکییان هەبوو. پاشەکشەی ئەورووپا لەهەردوو رووی ئابوری و سیاسیەوە، بووە هۆی بەریککەوتنی یەکێتی سۆڤێت و وولاتە یەککگرتووەکان وەك دوو زلهێزی جیهانی کە دەیانویست ڕۆڵێکی کاریگەرییان لەسیاسەتی دەولیدا هەبێت.

لەژێر رۆشنایی ئەم گۆڕانکارییانەو دابەشبوونی جیهان لەوکاتەدا بۆ ئۆردووگای خۆرهەلات و خۆرئاواو پەرەسەندنی ئەو

کێبەرکێیەی کە لەنێوانیادا هەبوو بۆ ئاڵۆزی سیاسی کە دواتر بەناوی جەنگی ساردەوە ناسرا، لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین جەنگی سارد زاراوەیەکە کە بۆ ئەو پەیوەندییە نێودەوڵەتیە تازەیە بەکاردەهات کە لەنێوان هاوپەیمانەکانی جەنگی دووەمی جیهاندا دروست ببوو، لەماوەی نێوان کۆتایی ئەم جەنگەو رووخانی یەکێتی سۆڤێتدا، واتە بەدرێژایی سالانی ١٩٤٥-١٩٩١ درێژەی کێشا(٤٩).

دوای رووخانی یەکێتی سۆڤێتو رژێمە سۆشیالیستەکانی ئەورووپای خۆرهەلات، ململانێی نێوان هەردوو بلۆکی خۆرهەلاتو خۆرئاوا کۆتایی هات. جیهان لەسیستمی دوو جەمسەرییەوە گۆڕا بۆ سیستمی یەك جەمسەری، جیهان پێی نایە سەردەمێکی نوێوە، سەردەمی پێکهاتنی تاك جەمسەریو سەردەمی سەرەتای جیهانگیری ئەمریکی، سیستەمی نێودەوڵەتی لەم قۆناغەدا بەرەو سیستمی نوێی جیهانی هەنگاوی نا.

(سیستەمی نوێی جیهانی) زاراوەیەکە بۆ یەکەم جار بۆشی باوك لەووتارێکیدا کە لەساڵی ١٩٩٠دا ئاراستەی گەلی ئەمریکای کرد بەبۆنەی ناردنی هێزی ئەمریکیەوە بۆ کەنداو بەکاری هێنا.

---

(٤٩) بڕوانە: پێشرەو حمەجان، سەرچاوەی پێشوو: ل٦٦

لەو وتارەدا خەسڵەتەکانی ئەم سیستمە نوێیەی بەم شێوەیە باس کرد، کە بریتییە لە: (لەدایکبوونی سەردەمێکی نوێ، سەردەمی ئاشتی بۆ هەمووگەلان، سەردەمێك کە ئازادە لەهەرجۆرە هەڕەشەیەکی تیرۆرستی بۆ سەر گەلان و دەوڵەتان، هاوکاری و هاوئاهەنگی نێودەوڵەتی بەتایبەتی لەڕێکخراوە ناوچەیی و نێودەوڵەتیەکانەوە، پەرەدان بەدیموکراسی و گەشە سەندن و ئاشتی، کەمکردنەوەی دیاردەی خۆپڕچەککردن، دەستێوەردانی مرۆیی بۆ پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و سنوردارکردن یاخود پابەندکردنی سەروەری دەوڵەتان لەپێناوی ئاسایشی دەوڵەتاندا... هتد)[٥٠].

لەپاش جەنگی سارد و بەهۆی لەبەریەك هەڵوەشانەوەی هەندێك دەوڵەت و سەرهەڵدانی ژمارەیەك ململانێ و جەنگی ناوخۆیی، کە ژمارەو ڕێژەی قوربانییەکانی کۆمەڵی نێودەوڵەتی تووشی شۆك کرد، وەك جەنگەکانی ناوچەی بەلقان، بەدیاریکراویش جەنگی بۆسنەو پاکتاوکردنی دانیشتوانە موسوڵمانەکەی لەلایەن سربەکانەوە، یان جەنگە ئیتنیەکانی ئەفریقیا بەتایبەتی جەنگی ناوخۆیی ڕواندا کە قوربانییەکانی سەدەها هەزارکەس بوون. ئەم

---

[٥٠] بڕوانە: عوسمان حەسەن شاکر، هەمان سەرچاوەی پێشوو: ل١١٨

جەنگ و ململانێیانە هەندێك دەوڵەتی تووشی شكست و لاوازی كرد لەئەنجامی ئەرك و لێپرسراوێتیەكانی لەبەرامبەر هاولاتیانیدا.

ئەم رووداوو گۆڕانكارییانە بوونە هۆی سەرنج راكێشانی كۆمەڵی نێودەوڵەتی و وایان لێكرد كە تەنها تەماشاكەرو بینەر نەبێت بۆ ئەم تراژیدیا و كارەساتانەو بەشێوەیەك لەشێوەكان ئەرك و بەرپرسیارێتی خۆی بەرامبەر بەو گەل و نەتەوانەی تووشی ئەو كارەساتەبوون لەڕێگەی دەستێوەردانی مرۆییەوە لەكاروباری ناوخۆی ئەو وڵاتانە، جێبەجێ بكات.

لەبەرئەوەیە كۆمەڵگای نێودەوڵەتی لەڕێگەی پرۆسەی جیهانگیرییەوە، لەچەند ئاستێكدا چەمكی رەهای سەروەری نیشتمانی تێپەڕاندووەو پاراستنی مافەكانی مرۆڤ و بەهاناوە چوونی گروپ و پێكهاتە لاوازەكانی ناو دەوڵەتێكی نەتەوەیی دیاریكراوی خستۆتە پێش بیرۆكەی پاراستنی سەروەری نیشتمانی دەوڵەتەوە.

دەستێوەردان لەكاروباری سربیا بۆ پاراستنی ئەلبانە كۆسۆڤۆییەكان و بڕیاردان لەسەر سەربەخۆیی تەیموری خۆرهەلات و بڕیاری پاراستنی كوردستانی عێراق دژ بەحوكمی

ڕژێمەکەی سەدام حوسێن، لەنمونە بەرجەستەو دیارەکانی لاوازبوونی بنەماکانی سەروەری نیشتمانین.

سەرباری ئەو مەترسیی و هەڕەشانەی سەبارەت بەڕۆڵی دەوڵەت و سەروەری نیشتمانی لەسەردەمی جیهانگیریدا باسکران، بەلاّم هەندێك لەپسپۆڕان پێیان وایە کە پرۆسەی جیهانگیری هەرگیز دەستبەرداری ڕۆڵی دەوڵەت نابێت بۆ ئەنجامدانی کارەکانی و دابینکردنی بەرژەوەندییەکانی، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەڵێن لەداهاتوودا ئەم گۆڕانکاریانە لەبەرژەوەندی دەوڵەت دەشکێنەوەو ئەوەی پێویستە تەنها ئەوەندەیە کە دەوڵەت هەندێك گۆڕانکاری لەمیکانیزمەو ڕۆڵە ئابورییەکەیدا بکات بۆ ئەوەی لەگەڵ جیهانگیریدا بگونجێت[٥١].

سکرتێری گشتی پێشوی نەتەوە یەکگرتووەکان (کوفی ئەنان) لەبارەی پرسی سەروەری دەوڵەتان لەسایەی بەجیهانیبووندا، وتارێکی لەگۆڤاری (ئیکۆنۆمیست)دا بلاّوکردۆتەوەو پێی وایە کە پرسی سەروەری دەوڵەتان بەو مانایەی کە تاکو ئێستاو بەر لەدەرکەوتنی پرۆسەی جیهانگیری هەیبووە، ئیتر لەناو پرۆسەی سەرلەنوێ داڕشتنەوەو هەمووارکردندایە، لانی کەم بەپێی خواستی

---

[٥١] بڕوانە: د. ئەنوەر محەمەد فەرەج، سەرچاوەی پێشوو: ل١٥٢

هێزەکانی جیهانگیریی و پرۆسەی هاریکاری نێودەوڵەتی، هەروەها دەڵێت لەمڕۆدا پێویستە حکومەتەکان بەپێی بەرژەوەندییەکانی خەڵك کاربکەن نەك بەپێچەوانەوە.

لەهەمان کاتیشدا چاودێریکردنی ماف و ئازادییەکانی مرۆڤ و سەروەری تاك وەك ئەوەی کە لەدەستوری نەتەوەیەکگرتووەکاندا باسکراون، لەسەر ئاستی جیهانی پشتیوانییان لێ دەکرێت.

یەکێکی تر لەخەسڵەتەکانی پرۆسەی جیهانگیری بریتییە لەپەرەسەندن و دەرکەوتنی کۆمەڵێك پرەنسیپ و بەهای سیاسی کە ئەرکی دەوڵەتانی جیهانە لەپرۆسەی حوکمکردنی وڵاتەکانیاندا رەچاوی بکەن. ئەو بەهاو پرەنسیپە سیاسیانەش وەك رێزگرتن لەمافەکانی مرۆڤ و پیادەکردنی میکانیزمەکانی کاری دیموکراسی و پلورالیزم و ئازادی بیروڕا لەژیانی سیاسیدا. بۆچوونە ناو هەندێك رێکخراوی نێودەوڵەتی و سوودمەندبوون لەکۆمەکی ئابوری نێودەوڵەتی، رێزگرتن لەم بەهاو پرەنسیپانە مەرجێکی سەرەکییە، حوکمکردن بەپێی ئەم پرەنسیپ و بەهایانە بەتێڕوانینی هەندێ لەپسپۆڕان وەك مۆدێلێکی حوکمڕانی لێهاتووە.

لەئێستاداو لەسایەی جیهانگیریدا، بەرپێگرتن و قەڵاچۆکردنی هەڕەشەی تیرۆر بەتەنها وەك پرسێکی ناوخۆیی دەوڵەت تەماشای ناکرێت، بەڵکو بووە بەپرسێکی نێودەوڵەتی، لەبەرئەوەی

لەهەمووکاتێکــدا مەترســی پەرەســەندنی هەڕەشــەی تــیرۆرو گواستنەوەی لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ئەگەرێکی کراوەیە، بۆیــە زلهێزانــی جیهــان لــەم بارەیــەوە بــێ دەنــگ نــابن لەهــەر کەمتەرخەمیەك.

ســەرەنجام لەسایەی سیستمی نوێی جیهانو جیهانگیریــدا، دەوڵــەت بەشــێکی زۆر لەچــەمکە کلاســیکیەکانی لەدەســتدەدا، بەتایبەتی رەگەزی سەروەری خۆیی (السیادة الذاتية).

واتــە، هــەردوو پرەنسیپی ســەروەریو دەستێوەرنەدان، ئەگەر وەك دوو چــەمکی رەهــا وەریبگــرینو ســەیری بکــەین لەگــەڵ ئــەو گۆڕانکــاریو پەرەســەندنانەی کــە بەســەر کۆمــەڵگاکانی ئــەمڕۆدا هاتوون ناگونجێن، ئەم دوو چەمکە پاشەکشەیان کردووە لەبەردەم ژمارەیــەك بــەهای تــردا، پاشەکــشەش چــەند شــێوازێکی بــەخۆوە بینیووە، هەندێکیان پەیوەندی بەپرەنسیپی رەهاوە نەماوە، بەڵکو بواردنەکانی زیادی کردووە.

لەســەرەتای ســەدەی بیــستەوە هــەوڵی زیــادکردنی پانتــایی خۆڕێکخستنو کــارکردن بــۆ یەکخستنی گــەلان درا بەشــێوازێکی جیــاوازتر لەشــێوەی دەوڵــەت، ســەرەنجام چــەندین رێکخــراوی نێودەوڵەتیو هەرێمیو ئاژانسی نێودەوڵەتی تایبەتمەند دامەزرا بۆ رێکخستنی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بەشێوازێکی نوێی کاریگەر

بــۆ هێنانــەدی خەونــەکانی مرۆڤایــەتی، کــە هــەردوو چــەمکی دەســتێوەرنەدان و ســەروەری بــەمانا رەهاکــەیان کۆســپی بــەردەم هێنانەدی ئەو خەونانە بوون.

لەم سۆنگەیەوە کۆمەڵی نێودەوڵەتی هەنگاوی ئازایانەی نا بۆ پابەنـدکردنی ســەروەری دەوڵــەت و دەســتێوەردان بـۆ رێکخســتن و چارەسەرکردنی زۆر مەسەلە کە دەوڵەتان بەو کارانەیان دادەنان کە لەچوارچێوەی دەستێوەردانی کرۆکی پسپۆری ناوخۆییەو رێگری کۆمــەڵی نێودەوڵــەتی دەکـرد لەدەسـتێوەردان، بێجگـە لـەرێکخراوە نێودەوڵەتیــەکان ئاژانــسەکانی تایبەتمەنــد رۆڵیــان زیــادی کــرد، قــەوارەو هێــزی جیــا لەقــەوارەی نەتــەوەیی دەرکــەوتن، وەك رێکخـراوی نـاحکومی و کۆمپانیـا فـرە رەگـەزەکان، وەك هێزێکـی کاریگـەر رۆڵـی بەرچـاویان بینـی لەپەیوەندییـە نێودەوڵەتیەکانـدا، ئـەوەش بـووە هـۆی کـەم بوونـەوەی رۆڵـی دەوڵـەت و حکومەتـەکان لەبوارە جیاجیاکانی ئابوری و کۆمەڵایەتی و تەنانەت سیاسیشدا.

هەنـدێ گۆڕانکـاری روویانـدا پەیوەنـدی بەپێـشکەوتنی یاسـای نێودەوڵەتیەوە هەبوو. زۆر بوارو پرسی رێکدەخست کە پێشتر بۆ پـسپۆری نـاوخۆیی دەوڵـەتان دانرابـوو، ئەمـەش بـووە هـۆی کـەم

بوونەوەی پسپۆرییەکانی دەوڵەت لەبەرژەوەندی پسپۆرییەکانی یاسای نێودەوڵەتی و رێکخراوەی نێودەوڵەتی[٥٢].

لەکۆتایی سەدەی بیستو سەرەتای سەدەی بیستو یەکدا، نەتەوە یەکگرتووەکان چالاکی و جموجوڵێکی زۆری بەخۆوە بینی بۆ چارەسەرکردنی قەیران و کێشە نێودەوڵەتیەکان بەشێوەیەك کە پێشتر وێنەی نەبووە، بەتایبەتی دەستێوەردان لەکێشەوگرفتە ناوخۆییەکان کە تا کاتێکی نزیك بەکارێکی ناوخۆیی لەقەڵەم دەدرا.

بەپێی برگەی حەوتی مادەی دووی پەیماننامەکە، نەتەوە یەکگرتووەکان بۆی نییە دەست لەکاروباری ناوخۆیی دەوڵەتان وەربدات، زۆرجار نەتەوە یەکگرتووەکان بەوە تۆمەتبار دەکرێ کە مادەی دووی پەیماننامەکە دەقێکی روون و راشکاو نییە، کە رێگە بەنەتەوە یەکگرتووەکان بدات دەست لەکاروباری ناوخۆیی دەوڵەتان وەربدات، دەبێ بیانوو بەڵگەی یاسایی بەهێز هەبێ کە نەتەوە یەکگرتووەکان پشتی پێ ببەستێ بۆ ئەوەی پاساوی

---

[٥٢] بڕوانە: خەلیل عەبدوللا، سەرچاوەی پێشوو: ل٤٧

دەستێوەردان بکات بەپێچەوانەی ئەمەوە ئەو دەستێوەردانە بەپێشێلکردنی دەقی پەیماننامەکەو کارێکی ناڕەوا دادەنرێ[٥٣].

دیارترین نموونەی دەستێوەردانی نەتەوە یەکگرتووەکان لەکاروباری ناوخۆی دەوڵەتاندا، دەستێوەردانی مرۆییە لەکوردستانی عیراق، کە نەتەوە یەکگرتووەکان بەپێی بڕیاری ژمارە (٦٨٨)ی رۆژی ٥ی نیسانی ١٩٩١ پێی هەستا، بەوەش سەرەتایەکی نوێ لەکاری نەتەوە یەکگرتووەکان دەستی پێکرد لەدەستێوەردانی ناوخۆیی بۆ پاراستنی مافەکانی مرۆڤ.

پاساوی سەرەکی دەرچوونی بڕیاری( ٦٨٨) دەستێوەردان بوو بۆ بەرژەوەندی گەلی عیراق بەگشتی و گەلی کورد بەتایبەتی بۆ پاراستنی لەسەرکوتکردنی رژێمی بەغدا، ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی لەو بڕیارەدا هەردوو لایەنی سەرکوتکردنی دانیشتوانی مەدەنی و هەڕەشەی بۆ سەر ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی پێکەوە گرێدابوو.

لەلایەکی ترەوە ئەنجومەنی ئاسایش لەڕێگەی بڕیاری( ٦٨٨)وە مامەڵەی لەگەڵ ئەو پرسەدا کردووە وەك کێشەیەکی نێودەوڵی نا، بەڵکو وەك کێشەی نێوان حکومەتی عیراق و دانیشتوانەکەی.

---

[٥٣] بڕوانە: عبدالفتاح عبدالرزاق، سەرچاوەی پێشوو: ل١٥٢

ئەنجومەنی ئاسایش ئیدانەی سەرکوتکردنی دانیشتوانی مەدەنی کردووەو میکانیزمی گونجاوی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە داناوە، سەرکوتکردنی ناوخۆییو هەڕەشەی بۆ سەر ئاشتیو ئاسایشی نێودەوڵەتی پێکەوە گرێداوە، بەمەبەستی ئەوەی پاساوێکی یاسایی بەهێزی هەبێ بۆ دەستێوەردان، چونکە ئەنجومەنی ئاسایش بەپێی مادەی (٢٤)و فەسڵەکانی (٦،٧،٨،١٢)ی پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەرکی سەرەکی پاراستنی ئاشتیو ئاسایشی نێودەوڵەتیە، ئەنجومەنی ئاسایش توانیوێتی دەسەلاتەکانی تەوزیف بکات بەپێی فەسڵی حەوت بۆ پاراستنی مافەکانی مرۆڤو چارەسەرکردنی کێشەکانو ناکۆکییە ناوخۆییەکان.

سەرباری ئەو راستیانەی کە بڕیاری (٦٨٨) لەخۆی گرتووە، دەتوانین بڵێین بڕیاری (٦٨٨) یەکەم پێشینەی دەستێوەردانی مرۆیی نێودەوڵەتی نیە، بەڵکو پێشتر نەتەوە یەکگرتووەکان دەستێوەردانی مرۆیی لەکاروباری ناوخۆی ئەفریقیاو رۆدیسیا کردووەو دواتریش نەتەوە یەکگرتووەکان لەبۆسنەو هێرزۆ گۆڤینیاو سۆماڵو رواندا و هایتیو کۆسۆڤۆو مۆزەمبیقو تەیموری خۆرهەلات دەستێوەردانی مرۆیی کردووە.

بەڵام سەرباری ئەو راستیانەی سەرەوە، دەتوانین بڵێین کە دەرکردنی بڕیاری (٦٨٨) وەرچەرخانێکی گەورەبوو لەفیقەو پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان کە رێگەی بەدەستێوەردانی مرۆییدا بۆ زامنکردنی پاراستنی مافەکانی مرۆڤ لەدژی ئەو دەوڵەتانەی کە ئەم مافە پێشێل دەکەن.

ئەم بڕیارە هەردوو پرەنسیپی سەروەری کلاسیکی و دەستێوەرنەدان لەکاروباری ناوخۆیی دەوڵەتانی کاڵ کردەوە.

هەروەها بەهۆی ئەو سەرکوت و کردەوە توندو تیژیانەی کە رژێمی سەرهەنگ محمد قەزافی لەدژی گەلی لیبیا پەیڕەوی کردو بوونە هۆی کوژرانی زیاتر لەدەهەزار کەس، لە(١٢)ی ئازاری ساڵی ٢٠١١دا کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەبی داوای لەئەنجومەنی ئاسایش کرد ناوچەی دژە فڕینی ئاسمانی بەسەر لیبیادا بسەپێنێ و بەر پرسیارێتیەکانی خۆی بەرامبەر بەگەلی لیبیا لەئەستۆبگرێ.

لەم سۆنگەیەوە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان لەڕۆژی (١٧)ی مارسی ئەم ساڵدا (٢٠١١) بڕیاری ژمارە (١٩٧٣)ی دەرکرد.

بەهۆی ئەم بڕیارەوە ئەنجومەنی ئاسایش ناوچەی دژەفڕینی ئاسمانی بەسەر ئاسمانی لیبیادا سەپاندو داوای گرتنەبەری هەموو رێوشوێنێکی کرد کە ببێتە هۆی پاراستنی هاوڵاتیانی

لیبیا لەدەستدرێژی هێزەکانی قەزافی، بەبۆردمانی ئاڵمانی هێزەکانی لیبیاشەوە. بەکردەوەش لە (١٩)ی مارسدا هاوپەیمانێتی نێودەوڵەتی بەسەرکردایەتی وڵاتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا و فەرەنسا لەپرۆسەی "بەرەبەیانی ئەودیسیا"دا هێرشی ئاسمانییان بۆ سەر ئامانجە سەربازییەکانی لیبیا دەست پێکرد[٥٤].

[٥٤] بڕوانە: محمد عبده حسنين، التدخل الدولي في ليبيا "فجر أوديسيا". جريدة شرق الاوسط، ٢٥ مارس ٢٠١١، عدد: ١١٠٨٥.

# باسی دووەم

## دامەزراوەکانی جیهانگیری و کاریگەرییان لەسەر سەروەری دەوڵەت

جیهانگیری لەڕێگەی چەند کۆمپانیاو دامەزراوەیەکی ئابوری و پیشەسازی و نەختیەوە، تێڕوانین و دنیابینی و سیاسەتەکانی خۆی لەبوارەکانی سیاسی و ئابوری و کلتوریدا پیادەدەکات.

ئەم کۆمپانیاو دامەزراوە ئابورییانە بەهۆی خواست و ئارەزوویان بۆ سوودو قازانجی خێرا، هەستاون بەدامەزراندن و کردنەوەی هەندێ کارگەیان لقی کۆمپانیا پیشەسازییەکانیان لەووڵاتانی تازە پێگەیشتوودا، ئەویش بەهۆی بوونی بازاڕی کاری هەرزانەوە، لەبەرئەوەی کالاو شمەکی بەرهەم هێنراو لەم ولاتانەدا ئاستی تێچوونی نزمەو ئەمەش بڕی قازانج دەباتە سەرەوە.

ئەم کۆمپانیاو دامەزراوانە ولاتەکانیان بۆ چەند جۆرێك پۆلێن کردووە، بەشێك لەم ولاتانە تایبەت کراون بۆ بەرهەم هێنان بەهۆی هەرزانی دەستی کاروکەمی نرخی تێچوونەوە، هەندێکی تریان تایبەتکراوە بەوەبەرهێنانی دارایی.

لەم باسەدا هەوڵدەدەین بەکورتی تیشکێك بخەینەسەر سێ دانە لەدیارترین و گرنگترین دامەزراوەکانی جیهانگیری ئەوانیش کە

بریتین لە: هەردوو دامەزراوەی بریتۆن وودز (بانکی نێودەوڵەتی بۆ بیناسازی‌و ئاوەدانکردنەوەو سندوقی دراوی نێودەوڵەتی)، رێکخراوی بازرگانی جیهانی World Trade Organization، کۆمپانیا فرە رەگەزەکان.

یەکەم: هەردوو دامەزراوەی برتیوون وودز (بانکی نێودەوڵەتی بۆ ئاوەدانکردنەوەو بیناسازی‌و سندوقی دراوی نێودەوڵەتی):

دوو دامەزراوەی فرەنەتەوەیین، بەهۆی رێککەوتنامەی برتیون وودزەوە لەساڵی (١٩٤٧)ەوە دەستیان بەکارکردووە.

بانکی نێودەوڵەتی بۆ بیناسازی‌و ئاوەدانکردنەوە کار بۆ دابین کردنی کۆمەکی ئابوری دەکات بۆ ئەندامەکانی بەتایبەتی وڵاتە تازە گەشەکردووەکان بەمەبەستی بەهێزکردنی ئابوری ئەم وڵاتانە.

ئەم بانکە پشتگیری‌و کۆمەکی گەلێك پرۆژەی وەبەرهێنانی ماوە درێژەی کردووە، لەوانەش پرۆژەکانی ژێرخانی ئابوری، ئەم بانکە بەپێی پرەنسیپەکانی کاری بازرگانی کاردەکات، واتە تەنها قەرز بەو وڵاتانە دەدات کە توانای دانەوەیان هەیە[55].

---

[55] بڕوانە: محمد ریاض (الابرش و نبیل ممدزوق، الخصخصة (أفاقها ما بعادها - حورات لقرن جدید) الطبعة الأولى، الفکر، دمشق، ١٩٩٩، ٢٧٨ص.

بەلام سندوقی دراوی نێودەوڵەتی (IMF) International Monetayyfand وەك دەزگایـــەکی پـــسپۆڕی نەتــــەوە یـــەکگرتووەکان لەســالّی (١٩٤٥) دروســت بــوو، بــەئامانجی پـشتگیری و بـەهێزکردنی کۆمـەکی نێودەوڵـەتی نێـوان دەوڵـەتان لەبواری دراوو داراییدا، لەپەیماننامەی رێکخراوەکەدا ئەو ئامانجە گـشتییانە دیـاریکراون کــە ئــەم دەزگــا نێودەوڵەتییــە هــەوڵی بــەدیهێنانیان دەدات، لــەو ئامانجانــەش: پــشتگیری کردنــی سەقامگیری دراوی جیهانی لەڕێگەی دروستکردنی سیستەمێکی جـێگیری مامەڵـەو ئـاڵوێری دراویــی، هێنانـەئارای سیـستەمێکی دراوی جیهــانی فرەلایــەن و فەراهــەمکردنی یــەدەگێکی دراوی لەچوارچێوەی سندوقەکەدا بـۆ یارمەتیـدانی ولاتـانی دراوسـێ بـۆ زاڵبـوون بەسـەر ئـەو تێکـچوونی هاوسـەنگییە کورتخانەیـەی کـە لەبودجەی خەرجییەکاندا دروست بووە[٥٦].

لەوەتەی ئەم قەیرانە جیهانییەی ئەم دواییـەش کۆتـایی هـاتووە ســـندوقی دراوی نێودەوڵـــەتی جـــەخت لەســـەر دیــــاریکردنی دەســـەلاتەکانی و نوێکردنـــەوەیان دەکــات بــەجۆرێك کــە هــەموو

---

[٥٦] بڕوانە: د.فلاح كاظم المهنة، العولمە والجدل الدائر حولها، الطبعة الأولى، دار الوراق للنشر، عمان، ٢٠٠١،ص ١٢٤.

سیاسەتەکانی ئابوری گشتی و کەرتی دارایی بگرێتەوە، کە کاریگەرییان لەسەر سەقامگیری جیهانی هەیە.

سیاسەتی دراوی پێش دروستبوونی ئەم دوو دامەزراوەیە، دەچووە بواری پسپۆڕێتی ولاتانی خاوەن سەروەرییەوە، بەلاّم لەدوای دروستبوونی ئەم دوو دامەزراوەیەوە رەوشی نێودەوڵەتی گۆڕی لەقۆناغی سەروەری دەوڵەتەوە لەبواری سیاسەتی دراویدا بۆ قۆناغی هەژموونی سیستەمی دراوی نێودەوڵەتی.

## دووەم: رێکخراوی بازرگانی جیهانی world Trade Organization

لەدایکبوونی رێکخراوی بازرگانی جیهانی کاری کردە سەر ئابوری جیهانی و پەیوەندییە ئابورییەکانی نێوان باکورو باشور، بەجۆرێك وای لەباکور کرد (٨٧٪) ی دەرامەتی جیهانی بۆ خۆی بێت و لە (٩٤٪)ی هەناردەکانی جیهانی هەر هی خۆی بێت.

رێکخراوی بازرگانی جیهانی لەگەڵ دەستبەکاربوونیدا کۆمەڵێك پەیوەندی بازرگانی چڕوپڕو تێکهەڵکێشراوی لەگەڵ خۆیدا هێنا، ئەم رێکخراوە کە (١٤٢) دەوڵەت ئەندامە تیادا، نیشانەی هەژموون و بالادەستی سیستمی سەرمایەدارییە بەهەموو پرەنسیپ و ئامرازەکانەوە.

لەسەر ئاستی جیهانی ئەم ڕێکخراوە کاری بۆ پتەوکردنی ئابوری جیهانی لەڕێگەی ئازادکردنی بازرگانی لەهەموو کوت و بەندەکان و بەرزکردنەوەی ئاستی داهاتی نەتەوەیی ڕاستەقینەی دەوڵەتانی ئەندام و ئاسانکاری و گەیشتن بە بازاڕە جیهانیەکان و کۆمەکی دەوڵەتان لەچارەسەرکردنی کێشەی میکانیزمە ئیدارییەکان کە پەیوەستن بە سیاسەتی بازرگانی و دارایی و نەختینەکانەوە.

بەهۆی دروست بوونی ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی، ئابوری جیهانی وەرچەرخانێکی گەورەی بەخۆوە بینی و کۆمەڵی نێودەوڵەتی ناچارکرد بۆ ئەوەی جارێکی تر بەپرەنسیپ و ئایدۆلۆژیا ئابورییەکانی خۆیاندا بچنەوە.

دوای ئەوەی ئەم ڕێکخراوە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر ئابوری جیهانی دانا، لەهەمان کاتیشدا بووە ڕوخسار و پێشڕەوی جیهانگیری و وەك بزووتنەوەی ڕاستەقینەی سیستمی سەرمایەداری خۆی دەرخست، ترسێك ولاتانی تازەپێگەیشتووی گرتەوە، ترس لەچارەنووسی خۆیان و ئابورییەکانیان کە بەرەو قەیران و هەڵدێر بڕواو بکەونە ژێر ڕەحمەتی ئابوری ولاتە دەوڵەمەندەکانەوە.

رۆژی (٣٠) ی تشرینی دووەمی ١٩٩٩، ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی ویستی کۆنگرەی وزاری خۆی لەشاری (سیاتل)ی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ببەستێ، ئەم رووداوە بووە هۆکاری ئەوەی کە جیهان گەورەترین خۆپیشاندان لەدژی ڕێکخراوەکەو لەدژی جیهانگیری بەخۆوە ببینێ ، ئەم خۆپیشاندانانە لەلایەن (٨٠٠) ڕێکخراوەوە کە سەر بە (٧٥) دەوڵەت بوون ڕێکخرابوو. ئەم خۆپیشاندانە لەلایەن ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنییەوە ڕێکخرابوو.

بەکورتی لەدایکبوونی ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی لەپاش تێپەڕبوونی قۆناغەیەك بەدوای یەکەکانی و گەیشتنی بەم قۆناغەی ئێستا، بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵێك دەستکەوتی لەگەڵ خۆیدا هێنا بۆ تێکڕای مرۆڤایەتی.

ڕێکخراوەکە گورێکی زیاتریدا بە دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو بەرەو جیهانگیری، جیهانگیرییەك کە رەهەندێکی گشتگیری (شمولی) لەبوارە ئابوری و کۆمەلایەتی و سیاسیەکاندا لێکەوتەوە. بەشێوەیەکی گشتی ولاتانی تازەپێگەیشتوو بەهۆی جیهانگیرییەوە توانییان چەند دەستکەوت و داهێنانێك بەدەست بێنن کە بریتیین لە:

پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا، بەهێزبوونی سیاسەتی دراوی، زیادبوونی سەرمایەی دراوی و ماڵی، ڕێککەوتن لەسەر بنەماو ڕێسای یاسا بازرگانییەکان.

هەرچەندە ئەم ڕێکخراوە لەبنەڕەتەوە هاتووە بۆ چەسپاندنی هاریکاری نێودەوڵەتی لەبواری بازرگانیداو کارکردن لەگەڵ بانکی نێودەوڵەتی و سندوقی نەختی نێودەوڵەتی و ئاژانسە پاشکۆکانیان لەپێناو زیاتر هێنانەدی هارمۆنی لەپرۆسەی دروستکردنی بڕیارە ئابوورییەکان لەنەتەوە یەکگرتووەکاندا، سەرەڕای گرتنە ئەستۆی چەند ئەرکێکی تر لەوانە: سەرپەرشتیکردنی جێبەجێکردنی ڕێککەوتنامەو پەیوەندییە بازرگانییەکانی نێوان دەوڵەتە ئەندامەکانی ڕێکدەخات، ڕێکخستنی ئەو دانوستاندنانەی کە لەئایندەدا لەنێوان دەوڵەتە ئەندامەکاندا ئەنجام دەدرێن، چارەسەرکردنی ئەو ململانێیانەی کە دەشێ ڕووبدەن لەنێوان دەوڵەتە ئەندامەکاندا لەکاتی جێبەجێکردنی ڕێککەوتنامە بازرگانییە نێودەوڵەتییەکاندا، چاودێریکردنی سیاسەتە بازرگانییەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان بەگوێرەی ئەو میکانیزمانەی کە لەسەری ڕێککەوتون[٥٧].

---

[٥٧] بڕوانە: ابراهيم العيسوي، الغات واخواتها، النظام الجديد للتجارة العالمية ومستقبل التنمية العربية، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت ١٩٩٥،ص ٨١.

### سێهەم: کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان Multinational Company

کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان ئەو کۆمپانیایانەن کە خاوەندارێتییەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ هەژمونی چەند ڕەگەزنامەیەکی جیاوازو هەمەڕەنگ، هەروەها لەڕووی کارگێڕیشەوە فرەیی بەسەریدا زاڵەو سنوری کارەکانیشی پانتاییەکی بەرفراوان لەخۆدەگرێ کە سنوری چەندین وڵاتی دوور لەیەكو جیاواز دەگرێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا سیاسەتو ستراتیژیو پلانی کارەکەی لەوڵاتێکی دیاریکراودا بەرنامەی بۆ دادەنرێو دادەڕێژرێ کە پێی دەوترێ دەوڵەتی دایك Home Country، هەرچەندە چالاکیەکانی سنوری نیشتمانیو هەرێمایەتی دەوڵەتی دایك تێدەپەڕێنێو کارو چالاکییەکانی دەباتە ناو وڵاتانی ترەوە کە پێیان دەوترێ دەوڵەتانی خانەخوێ Host Countries.

ئەم کۆمپانیایانە لەچالاکییەکانیاندا پشت بە بازاڕی چەندین وڵات دەبەستن، هەروەها سیاسەتو ستراتیژییەتو بڕیارەکانیشیان سروشتێکی نێودەوڵەتیو جیهانی هەیە، هەر لەم سۆنگەیەشەوەیە کە بەکۆمپانیا فرەڕەگەزەکان ناسراون لەبەرئەوەی سنورە نیشتمانیو نەتەوەییەکان تێدەپەڕێننو

لەئاستێکی بەرزی ئازادی جوڵەو گواستنەوەی سەرچاوەکان و ڕەگەزەکانی بەرهەمهێنان (سەرمایەو کار)، بەهرەمەندن[٥٨].

ئەم کۆمپانیایانە ڕۆڵێکی سەرەکییان هەیە لەفۆرمۆلەو دارشتنی خەسڵەت و میکانیزمەکانی سیستمی ئابوری جیهانی نوێ و جەخت کردنەوە لەسەر سروشتە جیهانی و سەروو نەتەوەییەکەی، هەروەها هۆکاری سەرەکی سەرهەڵدانی جیهانگیری بوون. کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان کە گرنگترین رووخساری دیاردەی جیهانگیری یان سیستەمی ئابوری مودیرنە، لەکۆمەڵێك خەسڵەت و تایبەتمەندی بەهرەمەندن، کە سروشتێکی جیاوازو تایبەتمەندی پێبەخشیوون و ڕۆڵ و کاریگەریشیانی لەسەر سیستەمی ئابوری هاوچەرخ دیاری کردووە، لەگرنگترین ئەو خەسڵەتانەش ئەمانەی خوارەوەن:

١. گەورەیی قەبارەکەی: یەکێك لەتایبەتمەندییە دیارەکانی ئەم کۆمپانیایانە گەورەیی و بەرفراوانی قەبارەکەیەتی وەك چەند قەبارەیەکی ئابوری زەبەلاح، لەونیشانانەش کە ئاماژەیەکن بۆ رادەی گەورەیی ئەم کۆمپانیایانە قەبارەی سەرمایەو پرۆژەکانی وەبەرهێنان و هەمەڕەنگی شمەك و ئەو کالآیانەی کە بەرهەمی

---

[٥٨] بڕوانە: هیڤی امجد حسن، سەرچاوەی پێشوو: ل٢٠

دەهێننو بڕی ئەو سوودو قازانجەی کە بەدەستی دەهێنن. بۆ نموونە بەپێی پێوەری تایبەتی ژمارەی کالاّ فرۆشراوەکان ئاستی داهاتو دەسکەوتی کۆمپانیای میتسوبیشی لەناو پێنج سەد کۆمپانیای فرەرەگەزدا بۆ ساڵی ١٩٩٥ بڕی ١٨٤,٤ ملیار دۆلار بووە کە دەکاتە لە ٤٤٪ کۆی بەرهەمی ناوخۆیی گشتی جیهانی[٥٩].

٢. زیادبوونی ئاستی هەمەجۆری چالاکییەکان: بەڕێوەبەرانو پلان داڕێژانی ئەم کۆمپانیایانە لەپێناوی کەمکردنەوەی ئەگەری زیانو دابەزینی ئاستی قازانجی کۆمپانیاکان ئەم ڕێوشوێنەی گرتۆتەبەر بەبەرفراوانکردنو هەمەجۆرکردنی شێوەو جۆری بەرهەمەکان.

٣ـ بڵاوبوونەوەی جوگرافی . بازاڕەکان: یەکێك لەخەسڵەتە دیارەکانی ئەم کۆمپانیایانە درێژبوونەوەی جوگرافیو بەرفراوانیو گەورەیی ئەو بازاڕەیە کە دایدەپۆشێت لەدەرەوەی دەوڵەتی دایك.

٤ـ دروستکردنی هاوپەیمانی ستراتیژی: لەگرنگترین تایبەتمەندییەکانی کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان دروستکردنی

[٥٩] بڕوانە، شركه متعدده الجنسيات، WWW.Marefa.org/index.

هاوپەیمانییـــە لـــەنێوان خۆیانـــدا بەمەبەســـتی دروســـتکردنی هاوپەیمانی ستراتیژی لەپێناوی پاراستنی بەرژەوەندییە ئابورییە هاوبەشـــەکانیان و پتـــەوکردنی تواناکانیـــان لـــەبواری کێبـــەرکێ و خستنەبازاڕەوە.

٥. تایبەتمەندی مۆنۆپۆڵی: کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان لەکۆمەڵێك تایبەتمەندی مۆنۆپۆڵی بەهرەمەندن، هۆکاری ئەم تایبەتمەندییەش دەگەڕێتـــەوە بـــۆ ئـــەوەی کـــە چوارچـــێوەی ئـــەو بـــازاڕەی کـــە ئـــەم کۆمپانیایانـــە کـــاری تێدەکـــەن شـــێوەی قـــۆرخکردنی کەمینەیـــەکی لـــەخۆگرتووە، ئـــەم کۆمپانیایانـــە توانیویانـــە قـــۆرخی تەکنـــەلۆژیای هاوچەرخ و توانا هونەری و کارگێڕییە باڵا و پسپۆڕەکان بکەن.

ئەمـــە ســـەرباری توانـــای ئـــاڵوێری بەرهـــەم و وەبـــەرهێنان لەســـەر ئاســـتی جیهـــان و کۆکردنـــەوەی ســـەرمایەی جیهـــانی لەچوارچـــێوەی ســـــــەرمایەی کۆمپانیاکانــــــدا، لەخەســــــڵەتەکانی کۆمپانیـــــا فرەڕەگەزەکانن.

# دەرئەنجام

١ـ بیرۆکەی دروستکردنی حکومەتێکی جیهانی یاخود جیهانگیر، خەونێکی مرۆڤایەتی بووە هەر لەسەردەمی گۆڕینەوەی شمەك بەشمەك (المقایضة) وە تا بەسەردەمی کشتوکاڵ و بازرگانی و شۆڕشی پیشەسازی و تا بەجیهانگیری دەگات، بەڵام جەنگ و جیاوازی بەرژەوەندییە نیشتمانیەکان و تایبەتمەندی نەتەوەیی و پابەندبوونی دەوڵەتان پێوەی، ئاستەنگ بوون لەبەردەم هێنانەدی و بەرجەستەکردنی ئەم خەونەدا.

٢ـ خاڵی سەرەکی لەجیاوازی نێوان توێژەران و سیستمی حوکمدا سەبارەت بەچەمکی جیهانگیری، بریتیە لەدووری نێوان شارستانیەتەکان و جیاوازی نێوان ئایدۆلۆژیا سیاسیەکان کە خۆی لەسیستمی دەسەڵاتداریێتی جیاوازو هەڵوێستی ئایدۆلۆژی هەر بەشێکیاندا دەبینێتەوە.

٣ـ جیهانگیری بەم چەمکە نوێیەی دیاردەیەکی نوێیە، با رەگوڕیشەی قوڵی مێژوویشی هەبێت، لەبەرئەوەی بەرهەمی پێشکەوتنی مرۆڤ و شارستانێتی مرۆڤایەتییە، هەروەها بەرهەمی

شۆڕشــی تەکنــەلۆژی‌و زانــستی ئــەم ســەردەمەیە بەشــێوەیەکی تایبەتی.

٤. چەمکی سەروەری بەمانا رەهاکەی، لەهەلومەرجی بالادەستی سیـــستمی فێـــودالی (دەرەبەگایـــەتی)و دەســـەلاتی کلێـــسەو ئیمپراتۆریەتی بەهێزدا سەری هەڵدا، کە بووە هۆی سەرهەڵدانی دەوڵــەت، ســەرباری ئــەوەش لــەپێناوی ئــەوەی وەك قەوارەیــەکی ســەربەخۆ بناســرێ‌و لێــی بڕوانــرێ، کۆمــەڵی نێودەوڵــەتی بــۆ ماوەیەکی دورو درێــژ بە چەمکی سەروەری رەهاوە پابەندنەبوو لەهەردوو بواری ناوخۆیی‌و دەرەکیدا.

٥ـ ئەو گۆڕانکاری‌و پەرەسەندنانەی کە لەدوا دەیەی کۆتایی ســەدەی پێــشووەوە روویانــداوە (واتــەی لــە ١٩٩٠ بــەدواوە)، دۆخێکی سیاسی نێودەوڵەتی‌و هەرێمی وای هێناوەتە ئاراوە کە چەمکی سەروەری بەمانا کلاسیکیەکەی ناتوانێ رووبەڕووی ئەم دۆخە نوێیە ببێتەوە، ئەمەش بەو مانایە دێت کە پابەندبوون‌و دەستگرتن بەو چەمك‌و تێگەیشتنە تەقلیدییەی کە سەبارەت بە سەروەری دەوڵەت هەیە، بەکردەوە دەبێتە ئاستەنگ لەبەردەم ئەو گۆڕانکاری‌و پەرەسەندنانەدا.

٦ــ دەوڵــەتان وردە وردە دەرکیــان بــەو راســتیە کــردووە کــە پابەنــدبوون بەچــەمکی ســەروەری کلاســیکییەوە دەبێتــە هــۆی

لەناوچـوونی خـودی دەوڵەتەکـە خـۆیو وای لێـدەکات بکەوێتـە پەراوێزی کۆمەڵی نێودەوڵەتیەوە، لەم سۆنگەیەوەیە کە دەوڵـەتان بەشـێوەیەکی گـشتی لەهـەوڵی ئـەوەدان ئەگـەر چـی نەشـتوانن بەتەواوەتی خۆیان لەگەڵ ئەم گۆڕانکاریانـەدا بگـونجێنن، ئەوا هـەر هـیچ نـەبێت لانـی کـەم بتـوانن لـەکاروانی رووداوو گۆڕانکارییـەکان بەجێنەمێنن.

٧ــ بـەهۆی سـەرهەڵدانی جیهانگیرییـەوە بەشـێوەو شـێوازە جیاوازە سیاسیو ئابوریو کلتورییەکانیەوە، کۆمەڵی نێودەوڵـەتی بـەکۆژان (معانـاة)ەکـانی گـەلی کـورد ئاشـنابوونو لەقـەبارەی ئـەو کارەساتو تاوانانە تێگەیشتن کە رژێمی پێشوو بەسەر ئەم گەلـەی هێناوە.

ئەم راستیانەش بوونـە فاکتـەرێك بـۆ بەئاگاهاتنـەوەی ویـژدانی مرۆڤایـەتیو دانـانی سـنورێك بـۆ ئـەو سـتەمو پێـشیلکاریانەی کـە بەرامبـەر بەگـەلی کـورد دەکـران، ئـەویش لەرێگـەی دەسـتێوەردانی نێودەوڵەتیـەوە بەمەبەسـتی کۆمـەكو پـشتگیری کردنـی گـەلی کـورد لـەپێناوی بەدەسـتهێنانی مافـە رەواکانیـدا، ئـەم دەسـتێوەردانەش بـەهۆی دەرچـوونی بڕیـاری ژمـارە (٦٨٨)ی ئەنجومـەنی ئاسایـشی ساڵی ١٩٩١وە بوو.

ئەم بڕیارە لەجێبەجێکردنەکەیدا کۆمەڵێك میکانیزمی پەیڕەو دەکرد کە تا ئەوکاتە تاڕادەیەکی زۆر نوێ بوون بۆ کۆمەڵی نێودەوڵەتی و بوونە هۆی پێشێل کردنی چەمکی سەروەری دەوڵەتی عیراق بەتێگەیشتنە کلاسیکیەکەی چەمکی سەروەری کە بەمانای سەروەری رەها دێت.

٨ـ برگەی حەوتی مادەی دووی پەیماننامەی نەتەوە یەککگرتووەکان بەشێوەیەکی رۆشن و راشکاو پرەنسیپی دەستێوەردانی رەتنەکردۆتەوە، بەڵکو داڕشتنی ئەم برگەیە بەشێوەیەکی لاستیکیەو ئاڵۆزیو ناڕۆنی پێوەدیارە، بەهۆی دیارینەکردنی پسپۆڕێتی دەوڵەت لەکاروبارە ناوخۆییەکاندا. کەواتە بەپشت بەستن بەم مادەیەو بەکردەوەش مافەکانی مرۆڤ بوونەتە پرسێکی نێودەوڵەتی.

٩. لەسەر دەوڵەتان پێویستە کە دیاردەی جیهانگیری کە بەهۆی میکانیزمو رەهەندە جیاوازەکانییەوە دنیای داگیرکردووە قبوڵ بکەن، هەروەها پێویستە بەووریاییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن (بەتایبەت وڵاتانی تازەپێگەیشتوو)، بەشێوەیەك خۆیان لەلایەنە سلبیەکانی بەدووربگرن.

# راسپاردەکان

١ــ پێویستە لەسەر لیژنەی یاسایی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان رۆڵێکی کاراو کاریگەری هەبێ لەسەر سەرلەنوێ دارشتنەوەی چەمك و زاراوە یاساییەکان، بەتایبەتی چەمکی سەروەری دەوڵەت بۆ ئەوەی لەگەڵ گۆڕانکارییە سیاسیەکاندا خۆیان بگونجێنن.

٢ــ لەسەر دەوڵەتان پێویستە، بەتایبەت دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو کە رێز لەمافەکانی مرۆڤ بگرن بەشێوەیەکی گشتی و بەتایبەتریش رێز لەمافە سیاسیی و کلتۆری و نەتەوەیی و ئایینیەکانی پێکهاتەو کەمینەکانی ناو سنووری وڵاتەکانیان بگرن، بۆ ئەوەی پێشێلکردنی ئەم مافانە نەبێتە هۆکارێك بۆ دەستێوەردان و پێشێلکردنی سەروەری نیشتمانی ئەم دەوڵەتانە.

٣ـ زیادکردن و بەهێزکردنی رۆڵی نەتەوە یەکگرتووەکان، بۆ ئەوەی هیچ دەوڵەتێك نەتوانێ بەپاساوی پاراستنی سەروەری

دەوڵـەت و ئاسایـشی گـشتی، مافـە بنەڕەتیـەکانی مـرۆڤ لـەڕووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیەوە، پێشێل بکات.

٤. کارکردنی ڕۆڵی ئەنجومەنی مافەکانی مرۆڤـی سـەر بەنەتـەوە یـەککگرتووەکان کـە لـە ٢٠٠٦/٣/١٥دا کۆمەڵـەی گـشتی نەتـەوە یەککگرتووەکان بڕیاری دامەزراندنی داوە، ڕاسپاردەو ئامانجەکانی ئەم ئەنجومەنە بکرێتە بنەمای پەیوەندییـە نێودەوڵەتیەکانی نێوان دەوڵەتان.

# سەرچاوەکان

## أ- سەرچاوە عەرەبییەکان

١- ابراهيم العيسوي، الغات وأخواتها، النظام الجديد للتجارة العالمية ومستقبل التنمية العربية، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت.

٢- بول هيرست و جراهام طومبسون، ماالعولمة؟ الأقتصاد العالمي وامكانات التحكم، ترجمة: د.فالح عبدالجبار، دراسات عراقية، بغداد . اربيل . بيروت ٢٠٠٩.

٣. بيشرةء حمه جان، تطور القانون الدولي العام في ظل النظام العالمي الجديد، مركز كردستان للدراسات الاستراتيجية، سليمانية، ٢٠١٠.

٤- د.جمعة صالح حسين محمد عمر، القضاء الدولي وتأثير السيادة الوطنية في تنفيذ الاحكام الدولية مع دراسة تحليلية لأهم القضايا الدولية، دارالنهضة العربية، القاهرة ١٩٩٨.

٥. د.حسن الجلبي، الوجيز في القانون الدولي العام، شركة الطبع والنشر الأهلية، بغداد ١٩٦١.

٦. د.حكمت شبر، السيادة في عالم متغيير، مكتب الفكر والتوعية في الاتحاد الوطني الكردستاني، سليمانية، ٢٠٠٦.

٧ـ د.سامى جاد عبدارحمن واصل، ارهاب الدولة في اطار القانون الدولى العام، منشأة المعارف بالاسكندرية، ٢٠٠٣.

٨ـ د.السيد عبدالمنعم المراكبي، التجارة الدولية وسيادة الدولة، دارالنهضة العربية، القاهرة، ٢٠٠٥.

٩ـ سيروان حامداحمد، الوضع القانوني لاتفاقية (Sofa) وتاثيرها في سيادة الدول واستقلادلها، مركز كردستان للدراسات الاستراتيجية، سليمانية، ٢٠١٠.

١٠. عبدالفتاح عبدالرزاق محمود، مبدأ عدم التدخل والتدخل في القانون الدولى العام، مطبعة وزارة التربية، اربيل ٢٠٠٢.

١١ـ د.عثمان على ميرانبك (الروانـدوزي)، السيادة في ضوء القانون الدولى المعاصر ودراسة السيادة العراقية ١٩٩١-٢٠٠٣، اربيل ٢٠٠٩.

١٢. د.فلاح كاظم المهنة، العولمة والجدل الدائر حولها، الطبعة الأولى، دارالوراق للنشر، عمان ٢٠٠١.

١٣ـ محمد عبده حسنين، التدخل الدولي في ليبيا "فجر اوديسيا" جريدة شرق الاوسط، ٢٥مارس ٢٠١١، عدد ١١٠٨٥.

١٤ـ محمد رياض الابرش ونبيل ممذوق، الخصصة (افاقها وأبعادها حوارات لقرن جديد) الطبعة الأولى، الفكر، دمشق ١٩٩٩.

١٥ـ هيڤى امجد حسن، اثر عولمة حقوق الانسان على مبدا السيادة (دراسة تحليلية)، چاپخانەی وەزارەتی کشتوکاڵ، هەولێر ٢٠٠٥.

**ب ـ سەرچاوە کوردییەکان:**

١ــ د.ئــەنوەر محەمــەد فەرەج،دەروازەیــەك بــۆ پەیوەندییــە نێودەوڵەتیەکان، مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك) ٢٠٠٩.

٢. خەلیل عەبدوڵڵا، پرەنسیپی دەستێوەرنەدان لەپەیماننامەی نەتەوەیەکگرتوەکاندا، مەکتەبی بیروهۆشیاری، سلێمانی ٢٠٠٥.

٣. دلێر ئەحمەد، کوردو بەجیهانیبوون، گۆڤاری بیروهۆشیاری ژمارە (٢)، مەکتەبی بیروهۆشیاری، سلێمانی ٢٠٠٢.

٤. عوسمان حەسەن شاکر، پرسی سەروەری دەوڵەتان لەسایەی بەجیهانیبووندا، گۆڤاری کەلتور ژمارە (٢)، لەبڵاوکراوەکانی ئەکادیمییای هۆشیاریو پێگەیاندنی کادران، سلێمانی ٢٠١٠.

٥. میلود بن غربی، ئایندەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسایەی جیهانگیریدا، وەرگێڕانی مافناس: جەمیل محەمەد، خانەی وەرگێڕان، سلێمانی ٢٠١٠.

٣-سەرچاوە ئەلکترونییەکان

١. بحث المعولمة WWW.isLamonLin.net

٢-ثنــاء عبيــد، العولمــة وعــالم مــتغير، مركــز الدراســات الــسياسية والاستراتيجية، ٢٠٠١/١/١ WWW.acpss.ahrak/ahram

٣. شركة متعددة الجنسيات. WWW.Marefa.org/indext

٤- موقع: WWW.buraydahcity.net

# جیهانگیری و کاریگەری لەسەر سەروەری دەوڵەت

پرۆسەی جیهانگیری بەهۆی ئەو کاریگەرییە گەورانەی کە لەسەر بوارە سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی، کلتورییەکان دروستی کردووە، دۆخێکی خوڵقاندووە کە بۆتە هۆی سەرلەنوێ پێداچوونەوە بەگەلێك لەو پرەنسیپ و چەمك و بەهایانەی کە تا ئەو کاتە بەشتێکی پیرۆز و قابیلی دەستکاری نەکردن و نەگۆڕ دانرابوون.
یەکێك لەو چەمکانەش کە گۆڕانێکی بنەڕەتی بەسەردا هات، چەمی سەروەری دەوڵەتان یاخود سەروەری نیشتمانییە.
سەروەری نیشتمانی لەلایەن حکومەت و رژێمە داخراوەکانەوە وەك شتێکی پیرۆز تەماشای دەکرێ و بەپاساوی پاراستنی ئەم پیرۆزییە سڵ لەئەنجامدانی هیچ تاوانێك ناکەنەوە دژ بەگەل و هاوڵاتیانی خۆیان.



ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران

2011